

# پێگەی ڕاستگۆیی یان الصدق

## کاریگەریەکانی لەسەر ئیماندران


نوسینی:

قاسم محسن عولا



باوکی شعیب

١٤٤٦هـ - ٢٠٢٤م




پێشەکی :

بسم الله الرحمن الرحيم

أن الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعذو بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهدة الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادى له ، واشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسله ...

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝١٠٢﴾ [آل عِمْرَان : ١٠٢]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ۝١﴾ [النِّسَاء : ١]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ۝٧٠ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ۝٧١﴾ [الأَحْزَاب : ٧٠ - ٧١]

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدى محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة فى النار أما بعد ...

**خوای گەورە دەفەرمووێت:**﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ۝٣٢﴾ [فَاطِر : ٣٢]واتە : {موسڵمان سێ جۆرە:} [ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ] پاشان هەندێك لە بەندەكانی خۆمان هەڵبژاردووەو ئەیانكەین بە میراتگری ئەم قورئانە پیرۆزە كە زانایانی ئوممەتی پێغەمبەری خوان- صلى الله عليه وسلم - [ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ ] لەناو ئوممەتی پێغەمبەریش - صلى الله عليه وسلم - هەیە زوڵم لە خۆی ئەكات ئەوانەن كە یەكخواپەرستن بەلام تاوانی گەورە ئەنجام ئەدەن، ئەمانە دەكەونە ژێر ویستی خوای گەورە ویستی لێبێت بە فەزڵی خۆی لێیان خۆش دەبێت بە هۆی تەوحیدو یەكخواپەرستییەكەیانەوە، وە ویستی لێبێت بە دادپەروەری خۆی بە ئەندازەی تاوانەكەیان سزایان دەدات و پاشان دەیانخاتە بەهەشتەوە، وە ئەمانە بەر شەفاعەت دەكەون [ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ ] وە هەشیانە مام ناوەندە تەنها واجبات

جێبەجێ ئەکات و خۆی لە حەرام ئەپارێزێ، بەڵام واز لە هەندێ لە سوننەتەکان دێنێت و هەندێ شتی مەکروهیش ئەنجام دەدات، ئەمانە لێپرسینەوەیەکی ئاسانیان لەگەڵدا دەکرێت، واتە: تاوانەکانیان نیشان دەدرێت پاشان خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت وبە رەحمەتی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە [ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ ] وە هەیشیانە بۆ هەموو خێرو چاکەیەك پێشبڕکێ ئەکات و واجب و سوننەتەکانیش جێبەجێ دەکات، وە خۆی لە حەرام و مەکروهیش ئەپارێزێ، ئەمانە بەبێ لێپرسینەوە دەخرێنە بەهەشتەوە [ بِإِذْنِ اللَّهِ ] بە ئیزنی خوای گەورە [ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ (٣٢) ] ئا ئەمە فەزڵی یەکجار گەورەی خوای گەورەیە کەسێك کە لە پێشەنگ دابێ لە کردەوەی چاکدا..؟!

بەلێ لەم پەرتووکەم دا من مەبەستم کرد بابەتێك باس بکە، ، هەلبەتە ئەم دیاردەیە لە رابردوو و لە ئێستاو لە داهاتووش هەر بەردەوام ، بەلکو لە دروست بوونی مرۆڤایەتیەوە هەر بەردەوام ، جا رێژەکەی دە گۆرێت بە پێ سەردەم و شوێن واتە : بەپێی زمان و مکان رێژەکەی دەگۆرێت ، ئەویش مەنزلی راستگۆییە ، لەم سەردەمەی ئێستا دا راستگۆیی رێژەکەی کەم ترە لە سالانی رابردوودا ، چونکە دۆر کردن تاوان و عەیب و شەرمە بوو ، بۆیە پیاوی راستگۆ زۆر بوون لە نێو تاکە کانی خەلکدا ، ئێستاش لەوەتەی زانتست و عەولەمە پێش کەوتووە خەلکی هەتا دۆر هەبی راستی نالێن ، چونکە زۆر کەم بێتەوە لە نێو خەلکی دا ، چونکە ئەگەر خەلکی هەموو رێگەی راستی بگرنە بەر ، ئەوا بەدلنیاییەوە کاریگەری خۆش کوزەرانی لە لە نێوان تاك و کۆمەلگادا ، هەروەها متمانە دروست دەبێت لە نێوان کاربەدەستان و تاکەکانی ئەم نیشتیمانە ، ولات تێدا ئەمن و ئاسایش و سەقامگیر و ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی بەرپا دەبێت ، هەر بۆیە راستی گەرانەوەیە بۆ لای خوای تاك و تەنها ، ئەمە رێگەی راستی خوا پەرستیە، هەر بۆیە منیش حەزم کرد خەرمانێك لە باسی راستگۆیی یان (الصدق ) بکەم ، چونکە بەرزترین مەنزلە و رەوەشتی بەرزی مرۆڤایەتی ، ئەو سوودەی مرۆڤ لە راستی دەستی دەکەوێت نرخ و بەهایی نیە لە دونیادا ، چونکە هەم سەفەراز و سەکەوتوودەبیت لە نێو خەلکی لە دونیادا ، هەمیش سەرفراز و سەرکەوتوو دەبێت لە قیامەتدا ، بەلێ رەوەشتی راستگۆیی جوانترین رەوشتە ، چونکە بەهاکەی هەر گیز پێوانە ناکرێت ، بۆ دایم کەسانی راستگۆ هەمیشە جێگەی خۆیان دەکەنەوە لە نێو دلی خەلکدا ، هەروەها منزلی راستگۆیی رێگەیەك بۆ بەختەوەری و ئاسوودەیی ئۆقەری دلەکان ، چونکە کەسی راستگۆ هەمیشە پشت پەنای بە خواوە بەستووە ، بۆیە (خوای گەورە ) هەموو شتێکی بۆ فەراهەم دەکات ، وە خیر لە دوای خیر بۆی زیاد دەکات ، چونکە ئەم مرۆڤە لە گەل نەفسی خۆی راستگۆ بووە بۆ هەمیشە لە ژیاندا ، هەر بۆیە سیفەتی راستگۆیی لە سیفەتی پێغەمبەران و پیاو چاکانە ، بۆیە کەسانی راستگۆ هەمیشە جێگەی متمانەی سپاردەو ئەمانەتن.

## پێناسەو ووتەی زانایان لەسەر ڕاستگۆیی یان (الصدق)

پێناسەی (الصدق ) لەرووی زمانەوانیدا:

ووتراوە : (ڕاستگۆیی پێچەوانەی دۆریە ، ئەوەش بەهۆی بە هێزیەکەی لە خۆێد ، چونکە درۆ هیچ هێزێکی نیە پووچەلە لە خۆیدا ، سەر چاوەی یان بنچینەی ئەمەش لەم ووتەیە : شتێك ڕاستە ، وە ئەمەش زۆر بەهێزە، و رمی ڕاستگۆی ، وە دەلێن: باوەریان پیێ بکەن بە شەر کردن ، وە بە پێچەوانەی درۆکردن ) .[1]

لە (الراغب ) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : ( ڕاستگۆیی دۆر کردن لەم ووتانە سەرچاوەی گرتووە کە لە رابردوودا بێت یان لە داهاتوو دا بێت ، بەلێنێك بێت یان شتێکی تر ، لە قسە کردن ڕوونادات تەنها لە کاتی هەوالێك یان جۆرەکانی کلام هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ [النِّسَاء : ٨٧] )[2] واتە: وە کێ هەیە قسەو هەواڵەکانی لە خوای گەورە ڕاستگۆتر بێ، واتە: کەس نیە..؟!

لە (ابن منظور ) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : (ڕاستگۆیی دژی یان بەرانبەری درۆکردنە ، وەکو دەلێن : ڕاستی ڕووداوێك هەوالێکی ڕاستگۆیی پیێ دەلێن ، وە باوەرم بە خەلکەکە یان ئۆممەتەکە هەبوو ، ڕاستیەکانم پیێ ووتن ، وە پیاوی ڕاستگۆ ئاگادار دەکرێتەوە بە (الصادق ) وە (الصديق ) : چونکە هەمیشە ڕاستگۆیە و پەسەندە ، هەر وەکو ئەو کەسەی ڕاستگۆیە لە کردارو ووتەدا ، زۆر ڕاستگۆیە زێدەرەوی دەکات لەڕاستگۆیەکەی )[3]

---

[1]- المقاييس اللغة (٣٣٩/٣).
[2]-المفردات ص (٤٧٨).
[3]-السان العرب (١٩٣/١٠).

له (القرطبي ) – رەحمەتی خوا لیّ بیّت – دەلیّت : (الصديقون ) .[4]کە (خوای گەورە) دەفەرمووێت: قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقٗا ۝٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە:
پیاوێك لە ئەنصارییەكان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - كە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فلانە كەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - شتێكە بیرم لێ كردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەكەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگەین، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەكسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەكەداو موژدەی پێدا: وە هەر كەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بكات- صلى الله عليه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو كەسانەیە كە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاكان [ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا ] كە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن كە مرۆڤ هاوڕێیەتی و هاوەڵێتیان بكات...؟!

له (ابن كثير ) رەحمەتی خوای لیّ بیّت – باسی کردووە لە تەفسیرەکەی دا لە (مجاهد ) – خوا لیّ رازی بیّت – دەلیّت : ( ئەوانەی راستی و راستگۆیان هیّناوە ئەوانە اصحاب یان هاودەمی قورئانی پیرۆزن ، هەمیشە قورئانیان لە سینگدایە وە هاوریّی قورئانی پیرۆزن ، وە باوەرداران دیّن لە رۆژی قیامەتدا دەلیّن: ئەمە قورئانە کە ئەم راستیەی پیّداین یان ئیّمە لە قورئانی پیرۆز فیّری راستی راستگۆیی بووین و فەرمانی پیّ کردووین کە راستگۆ بین ، مەبەستمانە وحی نیگایی بیّ هەلەیە ) .[5]

له (الجرجاني ) – رەحمەتی خوا لیّ بیّت – دەلیّت : ( راستگۆیی ، یان (الصدق ) هاوتایە یان یەکسانە بە بریاردان لە واقعدا ، وە ئەوە دژی یان پیّچەوانەی درۆیە ، وەك دەلیّن : یەکسانی نهیّنی و ئاشکرا ، یان دیار و شاراوە ، بەو بارودۆخەی کە بەندە درۆ لە کردەوەکانی دا نەکە ، وە نە کردەوەکانی و بارودۆخەکەی ، وە ئەمەش وودترینە دەبی ) .[6]

---

[4]-جامع لأحكام القران (٢٧٢/٥).
[5]-ابن كثير تفسير القران العظيم (٩٩/٧).
[6]-الجرجاني في (التعريفات ) ص (١٣٢).

لە (عبدالواحد کوری زید ) – خوا لیّ رازی بێت – ( راستگۆیی یان (الصدق ) بریتیە لە وەفاداری بۆ خودا بە کردارەکان ).

ووتراوە : راستگۆیی یان (الصدق ) بریتیە لە تەبایی نهێنی و پەنهانی مرۆڤ لە گەل قسەکانیدا .

ووتراوە: هاتابوون و یەکسانبوونی پەنهان و ئاشکرای مرۆڤ واتە: درۆزن ئاشکرای باشترە لە نهێنی و پەنهان ، وەك کەسی دوو روو کە دەرەوەی باشترە لە ناوە وەی .

ووتراوە : راستگۆیی یان (الصدق ) بریتیە لە ووتەنی حەق لە لای لە شوێنێکدا ووتەنی ئەو حەقە مایەی تیاچوون بێت .

ووتراوە: راستگۆیی یان (الصدق ) بریتیە لە ووتەنی حەق لە لای کەسێك لێی دەترسی یان رجای شتێکی لیّ دەکەیت .

لە (جنید) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : ( کەسی راستگۆ یان (الصادق) لە رۆژێکدا چل جار وەردەگەرێت واتە : چل تەکانی رووحی بەرەو پێش بە خۆی دەدات ، درۆزن چل سالّ لە دۆخێکدا دەمێنێتەوە و جێگر دەبێت ).

ووتراوە : لە فکردا پێچەوانەی ئەوە بەراست دەزانرێت ، درۆزن هەزار رەنگە و بە رەنگی دەوروبەر رەنگ دەکرێت و راستگۆ یان (الصادق) لەسەر یەك بارووادۆخە یان یەك حالە ، چونکە راستگۆ لە نەفسیدا یەك شتە ، بۆیە خاوەنەکەی هەزار رەنگ نابێت و ناگۆرێت .

ووتراوە : هەلگرتنی راستگۆیی وەکو هەلگرتنێکی چیایەکی مەزن وایە ، تەنها خاوەن عەزم و لێبران دەتوانن شان بدەنە ژێری ، ئەوان بەو کۆلە مەزنەوەوەك بارهەلگرێك بە بارێکی قورسەوە دەسورێنەوە ، ریا و درۆ سووك و ئاسانە وەك پووشێك کە هەلگرتنی هیچ ئەرك و ماندوو بوونێکی تێدا نیە ، ئەو لە هەر جیّ یەك بۆی رێکبکەوێت بەبیّ ماندبوون و دژواری و تیّ چوون دەستی بۆ دەبات و بەکاری دەهێنێت ، ئەو لە ژێر ئەو کۆلی ریا و درۆدا ماندوو نابێت و هەراسان نابێت .

لە (ابراهیم الخواص ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : راستگۆ یان (الصادق ) هەمیشە یان ل جیّ بەجیّ کردنی فەرزەکانی دایە یان لە ئەنجامدانی خێرو چاکەیەکی پەسەند و (مستحب ) دایە .

(جنيد) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : راستگۆیی ئەوەیە کە لە شوێنێکدا خاوەنی راستگۆیی بیت ، کە تەنها  بە درۆ تیایدا رزگار دەبێت ، واتە: راستی لەم شوێنەدا هەلوێستێکی جوان و جوامێرانەیە ، تەنها راستیەکە بێتە سەر زوبانت ، کەچی کە درۆت کرد رزگار دەبێت .؟!

ووتراوە : سێ شت لە دەستی راستگۆ دەرناچێت : تام و  شیرینی ،رووخساری شیرین و جوان ، رێزو هەیبەت و شکۆ .

عن (عبدالله بن مسعود ) ـ رضي الله عنه – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدي إلى البر ، وإن البر يهدي إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وغن الكذب يهدي إلى الفجور ، وإن الفجور يهدي إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[٧]

واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان راستگۆ بن بە راستی  راستگۆیی مرۆڤ رێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش رێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە راست دەکات و بەدوایی راستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە راستگۆ تۆمار دەکرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەراستی  دۆر مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت ..؟!)

[٧]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).

## پێگەی راستگۆیی یان (الصدق ) لە قورئانی پیرۆز

بەڵێ پێگە یان مەنزیلەی راستگۆیی لە مەزنترین رەوشتەکانە کە (خوای گەورە ) لە قورئانەکەیدا فەرمان بە بەندەکانی دەکات کە دەستی پێوە بگرن و رزگارتان دەکات لە دونیان لە قیامەتدا ، ئەگەر ئەم رەوشتە بۆ مرۆڤ مەزن یان گەورە و عظیم و تایبەتمەند بێت ، ئەوا رەوشتێکی باش دەبێت وەکو دەڵێن : (حسن خلق ) دەبێت ، چونکە یەکێکە لەم سیفەتانەی کە هەموو رەوشتەکانی مرۆڤ لە سەری بنیات نراون ، هەر بۆیە راستگۆیی مەرجی بنەرەتیە لە ژیانی هەموو ئیمانداریێکدا ، وە لە سەروی هەموو فەزیلەتەکان و رەوشتە ، هەروەها راستگۆیی پێگەو مەنزیلەی رێگەی (خوای گەورە) یە وە مەنزیلە و پێگەی پێغەمبەران و پیاو چاکانە چونکە راسترین رێگەیە ، وە وستاوترین رێگەش ئەوەیە هەر کەسێك درۆ بکات راستی نەلێت ئەوا بۆی ئاسان نابێت دەچێتە ریزی دابراوان و تیاچووانەوە ، چونکە بە پێگەی یان مەنزیلەی راستگۆیی یان (الصدق ) لە کەسانی دوو روو مونافیق جیادەکرێتەوە ، هەر بە راستگۆیی یان (الصدق ) دەبێتە دانیشتوانی بەهەشتەوە ،وە لە دانیشتوانی دۆزەخنشینان جیادەکرێتەوە ، چونکە راستگۆیی یان (الصدق ) شمشێری (خوای گەورە)یە لە سەر زەوی لە سەر هەر شتێك دابنرێت لەتی دەکات، روو بەرووی هەر پووچەلێك یان باتلێك بووبێتەوە بە زەویدا دەکێشێت و ژێری دەخات ، هەر بە راستگۆیەوە یان (الصدق ) هێررش بکات و پەلاماری بدات هەر گیز هێرشەکەی ناشکێت ، هەر کەس قسەیەك یان ووتەیەکی پێکرد دەنگی بە سەر نەیارەکانی دا بەرز دەبێتەوە وەك شێر نەرەی دەکات چونکە راست گۆیە ، چونکە راستگۆیی یان (الصدق) رووحی کاروکردەوەکان و مێزان یان کێشانەی هەموو باروو دۆخەکان یان ئەحواله ، هەر بەهۆی راستگۆیەوە یان (الصدق ) وە مرۆڤ شان دەداتە ژێر کارە سەخت و دژوارەکان ، ئەو دەرگایەیە کە گەیشتووان لێ یەوە دەچنە ژوو رەوە بۆلای (خوای گەورە ) ، بۆیە راستگۆیی یان (الصدق ) بنچینەی کۆشکی ئایینە ، وە پایەی راوەستان ئیرادەو یەقینە ، چونکە بەدلنیایەوە پلەی راستگۆیی یان (الصدق ) بەدوایی پلەی پێغەمبەرایەتی دا دێت ، کە گەورە ترو مەزنترین یان بالاترین پلەی هەموو جیهانە.

**بۆیە (خوای گەورە ) فەرمانی کردووە بە ئەهلی ئیمانداران لە گەل راستگۆیان بن یان صادیقان بن ، هەر وەك دەفەرموێت** : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ [التَّوْبَة : ١١٩] واته : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩) ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟!

**هەروەها (خوای گەورە ) فەرمانی کردووە لە گەل پێغەمبەران و راستگۆیان و شاهیدان و پیاو چاکان بن ، هەر وەك دەفەرموێت** : قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واته : [ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ] پیاوێك لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - کە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فلانە کەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - شتێکە بیرم لێ کردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەکەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگە ین، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات- صلى الله عليه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان [ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا ] کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی و هاوەڵێتیان بکات..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) فەرمانی کردووە هەر کەسێك خودا بەراست بزانێت ئەوا باشترین پلە و باشترین کارو کردەوەیە بۆ ئەم کەسە ، هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾﴾ [مُحَمَّد : ٢١] واتە: [ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَعْرُوفٌ ] ئەگەر گوێڕایەڵی خوای گەورەیان بکردایە وە وتەی باشیان بوتایە ئەمە باشتر بوو بۆیان [ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ ] وە کاتێك کە کارەکە جدی بوو، وە کوشتاری کافران دەستیپێکرد [ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ ] ئەگەر لەگەڵ خوای گەورە ڕاستیان بکردایەو ئیمانیان بهێنایەو گوێڕایە ڵی خوای گەورەیان بکردایە ئەوە بۆیان باشتر بوو لەوەی کە سەرپێچی خوای گەورە بکەن..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) هەوالی داوە دەربارەی ئەهلی چاکە و مەدح و سەنای باشترین کارو کردەوە ی کردوون : لە ئەهلی ئیمان و ئیسلام و راستگۆیان و ئارامگران و تەقواداران پەیماندەران ، هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ [البَقَرَة : ١٧٧] واتە : {شێوازی چاکە کردن } [ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ] چاکە تەنها ئەوە نیە کە ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، دیسان ڕەددە بۆ جوولەکەو گاورەکان کە زۆر قسەیان کرد سەبارەت بەگۆڕینی قیبلە [ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ] بەڵکو چاکە ئەوەیە کە هەر کەسێك ئیمان بێنێ بەخوای گەورەو بەڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبە ئاسمانیەکان و بە سەرجەم پێغەمبەرانی خوای گەورە [ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ ] وە لە کاتێکدا کە ماڵەکەی لەلا خۆشەویست و شیرینە ببەخشێ و بیدات بە خزمی نزیکی خۆی و بە بێباوکان و هەژاران و ڕێبواران و ئەوانەی کە لە ناچاریدا داوا ئەکەن و پێویستیانە و ئەوانەی کە کۆیلەن بەو پارەیە خۆیانی پێ ئازاد ئەکەن [ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ] وە نوێژەکانی بکات و زەکاتی ماڵەکەی بدات، وە ئەوانەی وەفایان هە یە بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بەخوای گەورەو بەخەڵکیان داوە [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وە ئەوانەی کە ئارامگرن لەکاتی سەغڵەتی و هەژاری و نەخۆشیدا، وە لە کاتی

جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئەمانە ڕاستگۆن لە ئیمانەکەیاندا، وە ئەمانە تەقوای خوای گەورەیان کردووەو موتتەقین نەك جولەکەو گاور..؟!

**بێ گومان (خوای گەورە ) خەلکی دابەش کردووە بۆ دوو چین ، ئەویش ڕاستگۆ ، وە دوو ڕوو ، هەر وەك دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾﴾ [الْأَحْزَاب : ٢٤] واتە: [ لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ ] تا خوای گەورە پاداشتی ڕاستگۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستگۆییانەوە کە باوە ڕدارانن [ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ ] وە سزای مونافیقان بدات ئەوەی کە ویستی لێ بێت و بەردەوام بێت لەسەر نیفاق [ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ] یان لێیان خۆشبێ لەوانەی کە تەوبە دەکەن [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا] بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییە..؟!

**بەلێ بنچینەی باوەر بریتیە لە ڕاستگۆیی یان (الصدق ) ، وە بنچینەی دووڕووی یان (نفاق ) بریتیە لە دۆرکردن یان (کذب ) ، چونکە درۆ کردن و ئیمان هەر گیز بەیەکەوە کۆنابنەوە ، ئەگەر کۆبوونەوە ئەوا یەکێکیان دژ بەوەی تر دەجەنگێت ، دەبێتە دوو ڕوویی یان (نقاف )..؟!**

**هەروەها (خوای گەورە ) هەوال دەدا بەو کەسانەی کە ڕاستگۆیی یان (الصدق ) هێناوە ، هەر وەك دەفەمووێت :** قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [الزُّمَر : ٣٣]واتە: [وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ ] وە ئەو کەسەی کە ڕاستی و تەوحیدو یەکخواپەرستی هێناوە کە پێغەمبەری خوایە -صلى الله عليه وسلم - ، یان جبریلە، یان سەرجەم پێغەمبەرانە [ وَصَدَّقَ بِهِ ] وە ئەوانەیشی کە بەڕاستیان داناوە، واتە: باوەڕداران، یان وتراوە: مەبەست پێی (ئەبوبەکری صدیق)ە (خوای لێ ڕازی بێت) کە یەکەم کەس بوو ئیمانی هێناوە [ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ] ئا ئەمانە بەڕاستی کەسانێکی موتتەقی و لە خواترس و خۆپارێزن..؟!

بەدلنیایەوە ئەو کەسەی کە ڕاستگۆیی یان (الصدق)یان هێناوە ، ئەو کەسەیە کە لە قسەو یان ووتە و ، وە کارو کرداری ، وە لە بارودۆخی یان حالیدا، خاوەنی شانو شکۆیی ڕاستگۆیی یە یان (الصدقە) چونکە ڕاستگۆیی یان (الصدق ) لەم سێ خالە دایە:

یەکەم : ڕاستگۆیی یان (الصدق ) لە قسە و گوفتاردا : بریتیە لە ڕاست بوونەوەی زمان لە ووتندا ، وەك ڕاست بوونەوەی گولە گەنم لە سەر قەدەکەیدا ..؟!

دووەم : ڕاستگۆیی یان (الصدق ) لە کارو کردەوە دا : بریتیە لە ڕاست بوونەوەی کارو کردەوەکان لە سەر فەرمانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە شوێن کەوتووانی پێغەمبەر ﷺ ، وەك ڕاست بوونەوە لەسەر جەستە ..؟!

سێ یەم : ڕاستگۆیی یان (الصدق ) لە بارودۆخی یان حالیدا : بریتیە لە ڕاست بوونەوەی لە بارودۆخی یان حالی دڵ و ئەندامەکان لە سەر دڵ سۆزیی یان ئیخلاص بۆ (خوای گەورە ) و پاکردنەوە یان خالیکردنەوەی هەول کۆششی خۆ بە وە بەختکردنی تواناکان ..؟!

بەڵێ بەم سیانە مرۆڤ دەبێت بەو کەسەی کە ڕاستگۆیی یان (الصدقی ) هێناوە ، وە بە پێی کمال و تەواو بوونی ئەم سێ خالە یان ئەم کارانە هەستان پێیان : ئەوا ڕاستگۆیی یان (صدیقیەت ) بەرهەم دەێت ، ئەم (صدیق) یان (صدیقیە ) بوو بە بەشی هاوەلی بەڕێز (ابو بکر صدیق ) — خوا لێ ڕازی بێت ، ئەم هاوەلە بەڕێزە لوتکەی هەموو کارەکانی بریتیە لە (صدیقییەت ) بە (صدیق ) ناوبرا ، یان پێیان دەووت : (ابو بکر صدیق ) چونکە بەهۆی ڕەها بوونی ڕاستگۆیی یان ((الصدق ) وە تیایدا ، بۆیە ووشەی (صدیق ) لە ووشەی (صدوق ) کاریگەرترو پر ماناترە ، ووشەی (صدوق )یش لە ووشەی (صادق ) کاریگەر ترو پر ماناترە ..؟!

بەڵێ بەرزترین ئاستی (صدق ) بریتیە لە (صدیقیەت ) کە بریتیە لە کمالی شوێنکەوتوان و جێپێ هەلگرتنی پیغەمبەری خوا ﷺ کە کمالی دلسۆزی و ئەیخلاصە بۆ (خوای گەورە ) ..؟!

**هەروەها (خوای گەروە ) فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە کە داوای لێ بکات بۆ ئەوەی کە (مدخل ) و (مخرج) واتە: چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوەی لە سەر ڕاستگۆیی یان (الصدق) بێت ، هەر وەك دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ٨٠﴾ [الإِسۡرَاء : ٨٠] واته: [ وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - كاتێك كە ڕۆیشتیتە مەدینەوە بڵێ: ئەی پەروەردگار چوونە ناو مەدینەم چاك و باش بێ، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - كە رۆیشتە شاری مەدینە فەرمووی: (خوایە مەدینەمان لا خۆشەویست بكە هەروەكو چۆن مەكەت لا خۆشەویست كردبووین، یان زاتریش لە مەككە، وە تەندروستی بكەو بەرەكەتمان بۆ بخەرە كێشانەو پێوانەوەی) [ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ] وە كە لە مەككەش دەركرام دەركردنەكەیشم هەر چاك بێت و بەعیززەت و سەركەوتنەوە بێت [ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا (٨٠) ] وە لەلایەن خۆتەوە حوجەو بەڵگە یەكی ئاشكرام پێ ببەخشە كە سەرم بخەیت و پشتیوانیم بكەیت..؟!

**هەروەها دەربارەی (ئیبراهیم ) — علیه السلام — کە راگەیاندووە کە داوای لێ کردووە کە زمانی راستگۆیی یان (الصدقی ) پێ ببەخشێ ، هەر وەك دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٤] واته : [ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ] وە زمانێكی ڕاستگۆم پێ ببەخشە لە دونیادا كە ئەوانەی دوای خۆم دێن بە باشە باسم بكەن و لە چاكەدا شوێنم بكەون..؟!

**هەروەها مژدەی بە بەندەکانی داوە کە لە لای (خوای گەورە ) دا شوێن و مەنزیلەی راستگۆییان هەیە ، هەر وەك دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ [يُونُس : ٢] واته: [ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ ] وە موژدە بدە بە باوە ڕداران كە پلەو پایەی بەرزو پاداشتی چاكیان بۆ هەیەو بەختەوەرن، یاخود كە كردەوەی چاكیان لە پێش خۆیانەوە ناردووە خوای گەروە لێیان وەرئەگرێ..؟!

**هەروەها ئەوانەی راستگۆن لە شوێنێکی بەرێز دان ، هەر وەك دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ٥٥﴾ [القَمَر : ٥٥] واته: لە شوێنێكی بەڕێزدان كە هیچ قسەی پوچ و بە تاڵ و درۆ و تاوانێكی تیادا نیە كە بەهەشتە، وە لەلای خوایەكن كە مەلیك و پاشای بەتواناو بەدەسەڵاتەو توانای هەموو شتێكی هەیە كە خوای گەورەیە، والله أعلم..؟!

بێ گومان ئەگەر سەرنج بدەین لە چوار ئایەتی پێشتر کە باسمان کرد ، ئاماژە بە پێنج وەسفی ڕاستگۆیی یان (الصدق ) دراوە کە ئەمانە بوون : (مدخل الصدق ) ، (مخرج الصدق ) و (السان الصدق ) و (قدم صدق ) و (مقعد الصدق ) ..؟! لێرە دا یەك یەکیان باسدەکەین إن شاء الله...

## یەکەم:(مدخل الصدق )(مخرج الصدق )یان چوونەژوورەوە ، چوونەدەرەوە:

بەلێ ڕاستگۆیی یان (الصدق ) ڕاستیەکی جێگیرە و پەیوەستە بە خوداوە و مرۆڤ بە خودت دەگەێنیت ، ئەوەی لە خوداوەیە و بۆ لای خودایە لە گوفتار و کردار و پاداشتیان لە دونیاو دوارۆژدا ..؟!

(مدخل الصدق ) چوونە ژوورەوەی یان (مخرج الصدق ) چوونە دەرەوە ی، ئاوا دەبێت کە چوونە ژوورەوەکە و هاتنە دەرەوەی ڕاست و جێگیر بێت و بۆ خودا ڕازی کردنی خودا بێت ، ئەمەش بەم هۆیەوە لە گەل خودا دابوون و بەدەستهێنانی داوای بەرز ، پێچەوانەی چوونە ژوورەوەی درۆ و چوونە دەرەوەی درۆیە کە هیچ ئامانجێکی تێدا نیە ، کە بیەوێت پێی بگات ، چونکە پەتی درۆ قەدێکی جێگیری نیە لە سەری ڕابوەستێت ، وەکو هاتنە دەرەوەی دوژمنانی خودا لە ڕۆژی (غەزای بەدر) دا..؟! یان وەك هاتنە دەرەوەی ڕاستگۆیان (الصدقین ) بۆ پشتیوانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (غەزای بەدر ) ..؟! بۆیە هەر بەم جۆرەش کە کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چوونە ژوورەوەی بۆ شاری مەدینە ، هەر بەم شێوەیەش هاتنەدەرەوەی لە شاری مەدینە بەرانبەر دوژمنانی (خوای گەورە ) لە ڕۆژی بەدر دا ، چونکە چوونە ژوورەوە و هاتنەدەرەوەی لە شاری مەدینە دا ، ئەمە ڕاست جێگیرە تەنها بۆ (خوای گەورە )یە ، یان ڕازی کردنی (خوای گەورە ) جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە) لە پێناوی ڕەزامەندی (خوای گەورە)دا بۆیە پالپشتی و کۆمەك و یارمەتی و سەرفرازی و سەرکەوتنی لە پێناوی ڕاستگۆیی یان (الصدق ) بەدەست هێنا ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وە هاوەلە بەرێزەکان بەهۆی ڕاستگۆییەوە یان (الصدق ) ئەوەی لە دونیاو دوارۆژ دا داوایان دەکرد بەدەستی هێنا ..!! بە پێچەوانەی چوونە ژوورەوەی درۆ کە دوژمنانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەر ﷺ بە خەیالی خۆیان دەیان ویست بەم درۆیەوە بچنە ناو شاری مەدینەوە لە (غەزای الاحزاب ) یان (غەزای خەندەق ) ئەوە بوو هەموو کافرانی دوورگەی عەرەبی هاوپەیمانیان لەگەل یەکتر بەست لە سەر بنچینەی درۆ کردن بۆ چوونە ژوورەوەی ناو شاری مەدینە ..!!

بەڵێ چوونەکە ئەم چوونە ژوورەوەیان بۆ خودا و لە پێناوی خودا دانە بوو، بە لکو بۆ دەست درێژی کردنە پیرۆزیەکانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ و موسلمانان لە ناو شاری مەدینە دا بوو ، هەر بۆیە جگە لەوەی کە سەر شۆرو ریسوایی و زەلیلی زیان لێ کەتن و درۆ کردن و هیچی تریان لێ دروێنە نەکرد ، بە سەر شۆری گەرانەوە شوێنی خۆیان ، چونکە چوونە ژوورەوەکەیان لەسەر بنچینەی درۆ پێك هێنابوو ، هەر بۆیە بەم جۆرە جوونە ژوورەوەی درۆ وە چوونە ژوورەوەی جوولەکە کانی (نەوەی قورەیزە ) بوو بۆ ناو قەلاکانیان ، لەبەر ئەوەی چوونە ژوورەوەیەکی درۆ بوو ..! ! چونکە ئەوەیان تووش بوو کە تووشیان هات ، لە سیرەی (ابن هشام) باسی دەکات ، بۆیە هەر چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوەیەك لە سەر راستگۆیی بێت بە خوداوەیە و بۆ خودایە ، ئەو کات خاوەنەکەی لە ژێر پارێزگاری خودا دایە ..! !وەك دەگێرنەوە هەندێ لە پێشینەکان لە مالەکەی دەردەچوو : سەر بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و دەی فەرموو: " خودایە ، پەنات پێدەگرم بە چوونە دەرەوەیەك کە لە ژێر پارێزگاری تۆ دا نەبم " مەبەستی ئەوە بوو : چوونە دەرەوەکەی چوونە دەرەوەی راستگۆیی نەبێت ، بۆیە (مدخل الصدق ) و (المخرج الصدق ) بە دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مککە و چوونە ژوورەوەی بۆ مەدینە تەفسیر کراوە ، گومانی تێدا نییە ئەوە تەنها نموونەیەکە ، ئەو چوونە دەرەوە و چوونە ژوورەوەیە لە مەزنترینیانە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگینا هەموو چوونە ژوورەوەیەکی پێغەمبەر ﷺ و چوونە دەرەوەیەکی لە سەر راستگۆیی یان (الصدق ) بووە ، چونکە ئەو بۆ خودا و بە خودا و فەرمانی خودا و رەزامەندی (خوای گەورە) وە بووە ..! ! بۆیە هیچ کەسێك لە مالەوە دەرنەچووە و رۆیشت بێتە ناو بازار یان شوێنی تر لە سەر راستگۆیی یان (الصدق) نە بوو بێت یان لە سەر درۆ ، چوونە دەرەوە و چوونە ژوورەوەی هەر کەسێك یان راستگۆییە یان درۆیە ، هەربۆیە (خوای گەورە) کۆمەك یارمەتی دەرە لە راستگۆیی رۆیشتنی ناو هەر کاروبارێك و چوونە دەرەوەی لێی یان لەسەر راستگۆیی یان دۆر کردن ، ئەگەر بۆ خودا لێ چوویە پێشەوە ئەو چوونە ژوورەوەی راستگۆییە یان (الصدق ) ، گەر بۆ خودا لێی هاتییە دەرەوە ئەوە چوونەدەرەوەی راستگۆییە یان (الصدق ) بە پێچەوانەش پێچەوانە دەر دەچێت کە درۆیە ..؟!

## دووەم : ( لسان الصدق ) واتە : زمانی ڕاستگۆیی

زمانی ڕاستگۆیی بریتیە لە مەدح و سەنای باش بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن گەلان و ئوممەتنی پێشوو بە ڕاستگۆیی یان (الصدق ) نەك مەدح سەنای بە درۆ ، وەك چۆن پێغەمبەر (ئیبراهیم ) و نەوەکانی لە پێغەمبەران – علیهم السلام – کە (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ٥٠﴾ [مَرْيَم : ٥٠] واتە : [ وَوَهَبْنَا لَهُمْ مِنْ رَحْمَتِنَا ] وە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆمان پێغەمبەرایەتی و ماڵ و منداڵ و کتابمان پێ بەخشین [ وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا] وە زمانی ڕاستگۆی بەرزمان پێ بەخشین، واتە: لەسەر زمانی بەندەکان بە باشە باس دەکرێن..؟! هەروەها دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْءَاخِرِينَ ٨٤﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٤] واتە: [ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ] وە زمانێکی ڕاستگۆم پێ ببەخشە لە دونیادا کە ئەوانەی دوای خۆم دێن بە باشە باسم بکەن و لە چاکەدا شوێنم بکەون..؟! بەلێ مەبەست بە زمانی ڕاستگۆیی : بریتیە لە سەنای باش و چاك ناو هێنان ، لەبەر ئەوەی ڕاستگۆیی بە زمانە ، چونکە زمان جێگەی ڕاستگۆییە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) زمانی بەندەکانی بە مەدح و سەنای باش لە سەر کەسی ڕاستگۆ پڕاندووە ، ئەمەش وەك پاداشتێك لە سەر ڕاستگۆیی لە ئەهلی ڕاستگۆیانە ، وە دەربرینی ڕاستگۆیی بە زمانی دەربارەیان. سێ مانا بۆ زمان کراوە : ئەمەی پێشوو کە ئاماژەمان پێدا ، دووەم : زمانی قسەکردن (اللغە ) وەك ئایەتی: قال تعالی: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ٤﴾ [إِبْرَاهِيم : ٤] هەروەها ئایەتی: قال تعالی: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ٢٢﴾ [الرُّوم : ٢٢] ، وە سێ یەمیان : مانا بۆ زمان مەبەستی ئەو پارچە گۆشتەیە لە ناو دەمدایە ، وەك ئایەتی : قال تعالی: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾ [القِيَامَة : ١٦] ..؟!

## سێیەم : (قدم الصدق ) واته : پێشکەوت بە ڕاستگۆیی :

پێشکەوتنی ڕاستگۆیی بە بەهەشت تەفسیر کراوە ، هەروەها بە محمد ﷺ تەفسیر کراوە ، هەر بەم جۆرە بەکارو کاردەوەی باش لێکدراوەتەوە ..؟!

ڕاستێتی پێشکەوتە (قدم ) ئەوەی پێش خۆیان خستووە و ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا ڕووی تێدەکەن و پێشوازی دەکەن ، ئەوان بە هۆی محمد ﷺ ە وە باوەر و کاروکردەوەی چاکیان پێشخست ، لە ڕۆژی دوایشدا ڕوو دەکەنە ئەو بەهەشتەی کە پاداشتی کارەکانیانە ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ [يُونُس : ٢] واته : [ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ ] وە موژدە بدە بە باوەڕداران کە پلەو پایەی بەرزو پاداشتی چاکیان بۆ هەیەو بەختەوەرن، یاخود کە کردەوەی چاکیان لە پێش خۆیانەوە ناردووە خوای گەروە لێیان وەرئەگرێ..؟!

هەر کەس بە بەهەشت تەفسیری کردووە مەبەستی ئەو پاداشتەیە کە ڕووی تێدەکەن ، هەر کەس بە کارو کردەوەی باش و بە پێغەمبەر ﷺ تەفسیری کردووە : لەبەر ئەوەی کاروکردەوەی باشیان پێشخستوە و باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ بەر خۆیان خستووە ، هەر کەسێکیان برتیین لە پێشکەوتەی (قدم الصدق ) ..؟!

## چوارەم : (مقعد الصدق ) واتە: کورسی یان جێگە یان شوێنی ڕاستگۆیی

(مقعد الصدق ) بریتیە لە بە هەشت لە لای (خوای گەورە) یە ، چونكە وەسفی هەموو ئەوانە بە ڕاستگۆیی جێگیر بوون و قەرارگرتنیان داواكراو و پێویستن ، ئەو وەسفكردنە حەق و بەردەوامبوون و سوود و قازانجی ڕاست و دروستە ، كەمالی بەری ڕاستگۆیش ڕاست و دروستە و گومانی تێدا نیە ، ڕاستگۆیی پەیوەستە بە (خوای گەورە) وە ، چونكە بە خوداوە بوونی هەیە هەر بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە ، ڕاستگۆیی ڕاستیە نەك درۆ كردنە ، ڕەواو حەقە نەك نارەوا پووچەلە ، بەردەوام و هەتاهەتاییە نەك تیاچوونە ، بە سوود و قازانجە نەك زیانبەخشە و پووچەلە ، چونكە وابەستەكانی پووچەل ڕێگەی چوونە ژوورەوەیان بۆ لای ڕاستگۆیی لێگراوە و نایگەیەنێ.

بەلێ لە نیشانەكانی ڕاستگۆیی دلنیایی و ئارامی و سكینەتی یان ئۆقەرەی دلە بەلایەوە ، بەلام لە نیشانەكانی درۆ ، سەرهەلدانی شك و گومانە، وەك لەم فەرموودەیە كە لە پێشدا باسمانكرد.

عن (عبدالله بن مسعود ) رضي الله عنه – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدي إلى البر ، وإن البر يهدي إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وغن الكذب يهدي إلى الفجور ، وإن الفجور يهدي إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[8]

واتە: لە (عبداللە كوری مسعود ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان ڕاستگۆ بن بە ڕاستی ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنمویی دەكات بۆ چاكە ، چاكەش ڕێنمویی دەكات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەكات و بەدوایی ڕاستیدا گەڕێت ، تا لای خوا بە ڕاستگۆ تۆمار دەكرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەڕاستی دۆر مرۆڤ بەرەوە كاری خراپ دەبات ، كاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەكات و بە دوایی درۆدا دەڕوات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت ..؟!)

[8]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).

## فەزڵ و گەورەی ڕاستگۆیی یان (الصدق) لە ژیانی مرۆڤی ئیماندار

یەکەم : گەراندنەوەی راستگۆیی بۆلای (خوای گەورە ) :

**بەلێ وەسفکردنی (خوای گەورە ) لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کە هەوالمان پێ رادەگەیەنی بە پیرۆزی راستگۆیی ، ئەمەشە لە دوو لایەنی سەرەکی شێوەی دەکرێت :**

١-ووتە یان فەرموودەی (خوای گەورە) راست دروستە :

**بەلێ هەموو شتێك لە قورئانی پیرۆزدا بە وەحی ونیگا دابەزیەوە ، لە سەر کاروباری دونیاو قیامەتدا لە لایەن خالق یان دروستکاری هەموو جیهانیان کە پەروەردگارمانە بۆمانی گێراوەتەوە ، ئەمەش هیچ شك و گومانێك هەلناگرێت ، هەروەك دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ ۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾ [النِّسَاء : ٨٧] واتە: [ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ] زاتی پیرۆزی الله ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی الله [ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ] کە خوای گەورە بەدڵنیایی کۆتان ئەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانێکی تیادا نیە [ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا] وە کێ هەیە قسەو هەواڵەکانی لە خوای گەورە ڕاستگۆتر بێ، واتە: کەس نیە..؟!

**بەلێ قورئانی پیرۆز ئەمە ووتە و فەرموودەی یان کلامی (خوای گەورە)یە ، چونکە رەوا حەقە راستگۆو راستیە جیاوازە لە کتێبە ئاسمانیەکان کە لە پێشتر دابەزیوە ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [المَائـِدَة : ٤٨] واتە: [ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - ئێمە قورئانی پیرۆزمان بۆ دابەزاندووی بەحەق کە هیچ گومانێکی تێدا نیە [ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ ] کە بەڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی لە تەورات و ئینجیل [ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ] بەڵام ئەم شایەت و ئەمیندارو باڵادەست و حاکمە بەسەریانەوە لەبەر ئەوەی ئەو کتابانەی تری هەمووی نەسخ کردەوەو حوکمیانی سڕیەوە، وە لە دوای دابەزینی قورئان دروست نیە کار بەو کتابانەی تر بکرێ وە بخوێندرێنەوە [ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ] تۆ لە نێوان ئەوانیشدا حوکم بەو قورئانە بکە کە خوای گەورە دایبەزاندووە( لە نێوان عەرەب و عەجەم و ئەهلی کتاب)..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویێت:** قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ١٢٢﴾ [النِّسَاء : ١٢٢] واته: [ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ] وە ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە وە کردەوەی چاکیان کردووە (کردەوەی چاك ئەوەیە کە بۆ خوا بێت و بۆ ریا نەبێت، وە لەسەر سوننەت بێت و بیدعە نەبێت) [ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ] ئەمانە ئەخەینە ناو بەهەشتەوە کۆمەڵە باخ و باخاتێك کە جۆگەلە ئاو بەژێریدا ئەڕوات و بەهەمیشەیی و بەنەمری تیایدا ئەمێننەوە [ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا ] ئەمە بەڵێنی خوای گەورەیە بەڵێنێکی ڕاستگۆیانەو حەقە وەکو بەڵێنەکانی شەیتان نیە [ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا] وە کێ هەیە وتەی ڕاستگۆتر بێ لە وتەی خوای گەورە، واتە: هیچ کەسێك نیە..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٩٥﴾ [آل عِمۡرَان : ٩٥] واتە : [قُلْ صَدَقَ اللَّهُ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بڵێ: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە [ فَاتَّبِعُوا مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ] ئێوە شوێنی دینی ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - بکەون بەپاکی لە شیرك لادەن بۆ سەر تەوحید [ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ] وە ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - لە هاوبەشبڕیاردەران نەبووە بەڵکو یەکخواپەرست بووە..؟!

۲-(خوای گەورە ) ڕاست و ڕاستگۆیە لە وعد و پەیمان و بەلێنەکانی دا :

بەلێ باوەڕ بوون بە وعد و پەیمان و بەلێنەکانی (خوای گەورە) چەسپاوە لە قورئان و سوننەت، وە لەو مەرجانەیە کە ئیمان بە (خوای گەورە) بە غەیب و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە پێغەمبەران ، وە (خوای گەورە) لە چەندین ئایەتدا لە قورئان سوێندی خواردووە لە سەر ئەو کارو کردەوانەی بەندەکانی وعد و پەیمان و بەلێنی داوە ..؟!

ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەلگەی وعد پەیمان و بەلێنی (خوا گەورە) یە بۆ وعد پەیمان بەلێنی :

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ٤ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ٥ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ٦﴾ [الذَّارِيَات : ١ - ٦] واته : [ وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ] خوای گەورە سوێند ئەخوات بە با، کاتێك کە ئەو خۆڵە بڵاو ئەکاتەوە..؟! [ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ] وە سوێند ئەخوات بەو هەورانە کە باری قورسیان هە ڵگرتووە کە پڕن لە ئاو..؟! [ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا] وە سوێند ئەخوات بەو کەشتیانەی کە بە ئاسانی باری قورسیان لەسەر دەریاکان هەڵگرتووە..؟! [ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ] وە سوێند ئەخوات بەو فریشتانەی کە فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ ئەکەن کە خوای گەورە دابەش کردنی ڕزق و ڕۆزی بەندەکانی پێ سپاردوون..؟! [ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ] ئەمە وەڵامی سوێند خواردنەکەیە: ئەو بەڵێنانەی کە پێتان دراوە لە مردن و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە بە دڵنیایی هەمووی ڕاستەو ڕوو ئەدات..؟! [ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ] وە بە دڵنیایی ڕۆژی سزاو پاداشتیش ڕوو ئەدات و گومانی تیادا نیە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ١ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ٢ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ٣ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ٤ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ٥ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ٦ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ ٧﴾ [المُرْسَلَات : ١ - ٧] واته: [ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا ] (الْمُرْسَلَاتِ) و (الْعَاصِفَاتِ) و (النَّاشِرَاتِ) مەبەست پێی فریشتەکانە، وە تەواوتر ئەوەیە کە مەبەست پێی بایە، خوای گەورە سوێند ئەخوات بە با کاتێك کە هێدی هێدی هەڵئەکات..؟! [ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا] (الْمُرْسَلَاتِ) و (الْعَاصِفَاتِ) و (النَّاشِرَاتِ) مەبەست پێی فریشتەکانە، وە تەواوتر ئەوەیە کە مەبەست پێی بایە، خوای گەورە سوێند ئەخوات بە با کاتێك کە هێدی هێدی هەڵئەکات..؟! [ فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا ] زاناکان جەختیان لەمەیان کردۆتەوە کە مەبەست



پێی فریشتەیە کە بەهۆی ئەو وەحییەی کە بۆ پێغەمبەرانی دێنن جیاوازی ئەخەنە نێوان حەق و باتڵ و حەڵاڵ و حەرام و هیدایەت و گومڕاییەوە..؟! [ فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا] ئەو مەلائیکەتانە کە وەحی و زیکر دێنن بۆ پێغەمبەران..؟! [ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا] ئەو وەحییە لەلایەن خوای گەورەوە ئەهێنن تا خەڵکی عوزریان نەمێنێت، وە ئینزارو ئاگادارکردنەوەیشە لە سزای خوای گەورە ئەگەر ئیمان نەهێنن..؟! [ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ ] ئەمە وەڵامی سوێند خواردنەکانە: ئەو هەڕەشانەی کە لە ئێوە کراوە بە هاتنی ڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو وەرگرتنی پاداشت و سزا بە دڵنیایی هەمووی ڕوو ئەدات و هیچ گومانێکی تیادا نیە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت: قال تعالى: ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ۝٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ۝٧﴾

[الطّور : ١ – ٧] واتە : [ وَالطُّورِ ] خوای گەورە سوێند ئەخوات بە کێوی (طور)، ئەو شاخەی کە خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسادا کرد - صلی الله علیه وسلم - لەسەری..؟! [ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ] وە سوێند بێ بەو کتابەی کە نووسراوەتەوە کە قورئانی پیرۆزە، یان (لوح المحفوظ)ە، یاخود ئەو لەوحانەیە کە خوای گەورە تەوراتی تیادا نووسیبووەوە بە موسای - صلی الله علیه وسلم - بەخشی، یان سەرجەم کتابە ئاسمانیەکانە کە نوسراونەتەوەو بەسەر خەڵکیدا خوێندراونەتەوە..؟![ فِي رَقٍّ مَنْشُورٍ] نووسراونەتەوە لە پێستی تەنکی ڕاخراودا، کە لە سەرەتادا قورئان لەو شتانە ئەنووسرایەوە..؟! [ وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ ] وە سوێند بێت بەو ماڵە ئاوەدانەی کە فریشتەکان ئاوەدانی ئەکەنەوە، (الْبَيْت الْمَعْمُور) لە ئاسمانی حەوتەمەو فریشتەکان عیبادەتی خوای گەورەی تیادا ئەکەن و تەواف بەدەوریدا دەکەن چۆن موسڵمانان لەسەر زەوی تەواف بە دەوری کەعبەدا دەکەن، ڕۆژانە حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی و دواتر دەرناچن، لەسەرووی کەعبەی پیرۆزەوە یە لە ئاست کەعبەی پیرۆزە..؟! [ وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ] وە سوێند بێت بە ئاسمان کە خوای گەورە وەکو سەقفێك بەرزی کردۆتەوە بەسەر زەویدا، یاخود سوێند بێت بە عەرشی پیرۆزی خوای گەورە کە لەسەرووی هەموو ئاسمانەکانەوەیە..؟! [ وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ ] وە سوێند بێ بە دەریا گڕ گرتووەکان کە لە ڕۆژی قیامەت هەموویان گڕ ئەگرن، یاخود وتراوە: ئەو دەریایانەی کە پڕ لە ئاون، یاخود بە مانای بەتاڵیش هاتووە، یاخود ئەو دەریایانەی کە خوای گەورە نایەڵێت بدەن بەسەر زەویداو سەر زەوی نقوم بکەن..؟! [ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ] ئەمە وەڵامی سوێند خواردنەکەیە: بەدڵنیایی سزای خوای گەورە جێبەجێ ئەبێت و ڕوو ئەدات و گومانی تیادا نیە بۆ هەر کەسێك کە شایەنی بێ..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) وعدی ڕاستگۆیی و پەیمان و بەڵێنی بە پێغەمبەران – علیهم السلام – وە بەندە چاکەکانی داوە بە سەرکەوتن بە سەر دوژمنان ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ۝٥١﴾ [غَافِر : ٥١] واتە: [ إِنَّا لَنَنْصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئێمە بە دڵنیایی پێغەمبەرانی خۆمان و باوەڕدارانیش سەرئەخەین بەسەر کافراندا لە ژیانی دونیادا، (ئەوانە یش کە شەهید کراون وەکو یەحیاو زەکەریا هەر سەرکەوتوو بوونەو خوای گەورە لە پاش خۆیان دینەکەی سەرخستوون و تۆڵەی لە دوژمنانیان سەندووەو ریسواو سەرشۆڕی کردوون لە دونیا پێش قیامەت) [ وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ] وە لە ڕۆژی قیامەتیش سەریان دەخەین بەوەی کە دەیانخاتە بەهەشتەوە لەو ڕۆژەی کە فریشتەکان هەڵئەستن و شایەتی ئەدەن بۆ پێغەمبەران..؟!

**هەروەها وعدی راساگۆیی و پەیمان و بەلێنی (خوای گەورە) بە موسلمانان لە ڕۆژی غەزای بەدر دا ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝١٠﴾ [الأَنفال : ١٠] واتە: [ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَى ] وە خوای گەورە ئەم پشتیوانیەی ئێوەی کرد بەم فریشتانە ئەمە تەنها مژدەی سەرکەوتنە بە ئێوە [ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ] وە تا دڵیشتان پێی ئارام بێت [ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ] وە سەرکەوتنیش نیە تەنها لەلایەن خوای گەورەوە نەبێت، تەنانەت لەلایەن ئەو مەلائیکەتانەش نیە کە خوای گەورە بۆ ئێوەی ناردووە [ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر باڵادەست و زاڵ و کاربەجێیە..؟!

**هەروەها وعدی ڕاستگۆیی و پەیمان و بەلێنی (خوای گەورە ) بۆ پێغەمبەر ﷺ وە موسلمانان فتح کردنی شاری مککەی پیرۆز لە دەستی کافران و موشریکانی قورەیش ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت**: قال تعالى: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ۝٢٧﴾ [الفَتْح : ٢٧] واتە: {خەوبینینی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - وەحییە} [ لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ ] پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم - خەوی بینی لە خەویدا ئەچنە مەککەوەو تەواف و عومرە ئەکەن و لە مەدینە خەوەکەی بۆ هاوەڵان گێڕایەوە، خوای گەورە خەوبینینەکەی پێغەمبەری خوای



- صلى الله عليه وسلم - بەڕاست گێڕا، وە خەوی پێغەمبەران وەحیەو لەلایەن خوای گەورەوەیە خەوێکی حەق بوو کە ئێوە بە دڵنیایی ئەچنە ناو (مسجد الحرام) و کەعبەی پیرۆزو تەواف ئەکەن (إن شاء الله) [ آمِنِينَ ] وە بە ئەمینیش، بەڵام بۆ ساڵی داهاتوو [ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ ] هەتانە سەرتان ئەتاشن وە هەیشتانە کورتی ئەکەنەوە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - سێ جار دوعای کردووە بۆ ئەو کەسانەی قژیان دەتاشن لە حەج یان عومرە، بەڵام یەك جار دوعای کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە قژیان کورت دەکەنەوە [ لَا تَخَافُونَ ] وە ترسی دوژمنیشتان نابێت [ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ] وە ئەوەی کە خوای گەورە زانی ئێوە نەتانزانی کە ئەمساڵ ناچنە مەککەوەو عومرە ناکەن خێری تێدایە، یان ئەوەی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - زانی ئێوە نەتانزانی خوای گەورە بە خەو پێی وتبوو کە لە دوای حودەیبیە، یان لە دوای فەتحی خەیبەر ئەچنە ناو مەککەوەو فەتحی مەککەشتان بۆ ئەکەین..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) وعدی ڕاستگۆیی و پەیمان و بەڵێنی داوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ و موسلمانان لە غەزای (الاحزاب یان خەندەق ) کە بەسەر کەوتن بە سەر موشریکان کافراندا ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسۡلِيمًا ٢٢﴾ [الأحزاب : ٢٢] واتە: {هەڵوێستی جوامێرانەی باوەڕداران} [ وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ ] وە کاتێك باوەڕداران ئەو هەموو حیزبەیان بینی کە لێیان کۆبوونەتەوە [ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ ] وتیان: ئەمە ئەو بە ڵێنەیە کە خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بە ئێمەیان داوە بە سەرکەوتن لە دوای تاقیکردنەوە [ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ] وە خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ڕاستیان فەرمووە [ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا ] وە هیچ شتێکیان زیادی نەکرد تەنها ئیمان هێنان بەخوای گەورەو تەسلیم بوونیان نەبێ کە خۆیان تەسلیمی خوای گەورە کردو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوایان - صلى الله عليه وسلم - کرد، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیادو کەم دەکات، بە ئیمان و کردەوەی چاك زیاد دەکات، وە بە کوفرو تاوان کەم دەکات)..؟!

دووەم : پابەند بوون بە کەسانی ڕاستگۆ یان (الصادقین ) :

**بەڵێ ڕاستگۆیی یان (الصدق ) لە سەرووی هەموو فەزیلەتێکە ،چونکە ڕاستگۆیی جوانترین و ستایشترین ڕەوشتە ئەگەر مرۆڤ پێ تایبەند مەندبێت ، بەدڵنیاییەوە ئەوا هیبەت و شان و شکۆمەندی بەرزترو زیاتر دەبێت ، هەر بۆیە ڕاستگۆیی پێویستە بۆ گەیشتن بە ڕێك و پێکی ، وە ڕاستگۆیی هەموو ماناکانی خێرو چاکە دەگەیەنی لەم جیهانەدا ، چونکە بەم شێوەیە مافەکان دەپارێزی ، گیان و رووحەکان تێدا پارێزراون ،وە ڕاستگۆیی دەبێتە سیستەمێکی ڕێك وپێك لە شوێنی خۆیدا ، کە مرۆڤە کانی لە ژیانێکی خۆش سەلامەتی ئاسایش و دڵنیابوون لە نەفسی خۆیان و ماڵ و سامان وە شەرفو ناموسیان پارێزراو دەبێت ، چونکە ناونیشانی ئیسلام (میزان ئیمان) ە وە ئەمەش بنچینەی ئایینی ئیسلامە ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) فەرمانی کردووە بە بەندەکانی خۆی کردووە ، کە پێویستی یان هاودەم وە یان هاوڵی ڕاستگۆیان بن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى:** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ۝١١٩﴾ [التَّوۡبَة : ١١٩] واتە : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموێت :** قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ۝٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩]واتە: [ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ] پیاوێك لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - کە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فڵانە کەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - شتێکە بیرم لێ کردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەکەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگە ین، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات- صلى الله عليه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ

ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان [ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا ] کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی و هاوەڵێتیان بکات..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرمووێت:** قال تعالى: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩﴾ [المَائـِدَة : ١١٩] واتە: [ قَالَ اللَّهُ هَذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ] خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانەی کە لە دونیادا ڕاستگۆبوونە ئێستا ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ ئەگەیەنێ، (ابن عباس) ئەفەرمێت: ڕۆژێکە یەکخواپەرستی سود بە یەکخواپەرستان دەگەیەنێت [ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ] ئەوە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە ئەیانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات و جۆگەلە ئاو بەژێر خانو دارەکاندا تێ ئەپەڕێ [ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ] بەهەمیشەیی و بەنەمری تیایدا ئەمێننەوە [ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ] خوای گەورە لێیان ڕازیە بەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیا کردوویانە [ وَرَضُوا عَنْهُ ] ئەوانیش بەو بەش و پاداشتەی کە خوای گەورە ئەیانداتێ پێی ڕازین کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتووە [ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ] ئا ئەمە بردنەوەی هەر گەورەیە کە مرۆڤ بچێتە بەهەشتەوە..؟!

**لە (ابو موسى الاشعرى ) — خوا لێ ڕازی بێت — دە گێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی** : ((إِنَّما مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ، والْجَلِيسِ السَّوْءِ، كَحامِلِ المِسْكِ، ونافِخِ الكِيرِ ، فَحامِلُ المِسْكِ: إمَّا أنْ يُحْذِيَكَ، وإمَّا أنْ تَبْتاعَ منه، وإمَّا أنْ تَجِدَ منه رِيحًا طَيِّبَةً، ونافِخُ الكِيرِ: إمَّا أنْ يُحْرِقَ ثِيابَكَ، وإمَّا أنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً )).[٩] **واتە: نموونەی هاونشینی چاك و هاونشینی خراپ وەك هەڵگری میسك و کورەی ئاگر وایە ، هەڵگری میسك یان بەشت دەدات ، یان لێی دەکرێت ، یان بۆنی خۆشی بەسەر تا دێت ، کورەی ئاگریش یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆ نێکی ناخۆش دێت بە سەرتا دێت ..؟!**

---

[٩]-صحيح مسلم برقم (٢٦٢٨).



**لە** (ابو هريره ) — **خوا لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((إنَّ لِلَّهِ مَلايِكَةً يَطُوفُونَ فى الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أهْلَ الذِّكْرِ، فإذا وجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنادَوْا: هَلُمُّوا إلى حاجَتِكُمْ قالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بأَجْنِحَتِهِمْ إلى السَّماءِ الدُّنْيا، قالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ -وهو أعْلَمُ منهمْ- ما يَقولُ عِبادِى؟ قالوا: يَقولونَ: يُسَبِّحُونَكَ ويُكَبِّرُونَكَ، ويَحْمَدُونَكَ ويُمَجِّدُونَكَ، قالَ: فيَقولُ: هلْ رَأَوْنِى؟ قالَ: فيَقولونَ: لا واللَّهِ ما رَأَوْكَ، قالَ: فيَقولُ: وكيفَ لو رَأَوْنِى؟ قالَ: يقولونَ: لو رَأَوْكَ كانُوا أشَدَّ لكَ عِبادَةً، وأَشَدَّ لكَ تَمْجِيدًا وتَحْمِيدًا، وأَكْثَرَ لكَ تَسْبِيحًا، قالَ: يقولُ: فَما يَسْأَلُونِى؟ قالَ: يَسْأَلُونَكَ الجَنَّةَ، قالَ: يقولُ: وهلْ رَأَوْها؟ قالَ: يقولونَ: لا واللَّهِ يا رَبِّ ما رَأَوْها، قالَ: يقولُ: فَكيفَ لو أنَّهُمْ رَأَوْها؟ قالَ: يقولونَ: لو أنَّهُمْ رَأَوْها كانُوا أشَدَّ عليها حِرْصًا، وأَشَدَّ لها طَلَبًا، وأَعْظَمَ فيها رَغْبَةً، قالَ: فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ؟ قالَ: يقولونَ: مِنَ النَّارِ قالَ: يقولُ: وهلْ رَأَوْها؟ قالَ: يقولونَ: لا واللَّهِ يا رَبِّ ما رَأَوْها، قالَ: يقولُ: فَكيفَ لو رَأَوْها؟ قالَ: يقولونَ: لو رَأَوْها كانُوا أشَدَّ مِنْها فِرارًا، وأَشَدَّ لها مَخافَةً، قالَ: فيَقولُ: فَأُشْهِدُكُمْ أنِّى قدْ غَفَرْتُ لهمْ، قالَ: يقولُ مَلَكٌ مِنَ المَلايِكَةِ: فيهم فُلانٌ ليسَ منهمْ، إنَّما جاءَ لِحاجَةٍ، قالَ: هُمُ الجُلَساءُ لا يَشْقَى بهِمْ جَلِيسُهُمْ )) . [١٠]

---

[١٠]-صحيح البخاري برقم (٦٤٠٨).

بەلێ (خوای گەورە) وەسفی ئەو کەسانەدەکات لە پیاوان ئافرەتان کە ئەم سیفەتە جوان و ڕەوشت بە نرخانەیان هەیە ، کە ئەمەش سیفەتە هەر گەورە پر بە نرخەکانی مرۆڤی ئیمانداره ، ئەویش هەر هەمووی کردەوەکانی دل و کردەوەکانی لاشە و گوفتاری زمانە ، ئەوەش لە نێوان کارو کردەوەی خێرو چاکەیە ، وە وازهێنانی لە کردەوەی خراپە ، ئەمەش کە پێی پابەند بووی ئەوا پابەند بووی بە هەموو ئایینەوە ، ئەمەش بە ئاشکرا لە دەرەوە ، وە بە نهێنی لە ناوەوە ، بە ئیسلام و ئیمان و ئەحسان ، ئەمانەش پاداشتەکەی لێ خۆش بوونی (خوای گەورە)یە وەرگرتنی خێرو چاکە کاری ، هەروەها نەمانی شەرو خراپەکاری ، داوا لە (خوای گەورە) دەکەم کە منیش یەکێك بم لەم سیفەتە جوان بەرز بەنرخ پر بەها جوانەکانی بەندایەتی بۆ (خوای گەورە).

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥﴾ [الأَحْزَاب : ٣٥] واتە : {لە پاداشت وەرگرتندا جیاوازی لە نێوان ژن و پیاودا نیە} [ إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ ] (ئوم عومارەی ئەنصاری) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - وتی: هەموو شتێك تەنها باسی پیاوانەو نابینم باسی ئافرەتان بکرێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، وە (ئوم سەلەمەی) خێزانی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بۆ ئێمەی ئافرەتان لە قورئاندا باس ناکرێین وەکو پیاوان کە باس دەکرێن؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: بەڕاستی پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان، (هەر چەندە کە خوای گەورە بفەرمێت (الْمُسْلِمِينَ) ژن و پیاو دەگرێتەوە) [ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ] وە پیاوانی باوەڕدارو ئافرەتانی باوەڕدار [ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ ] وە پیاوانی خواپەرست و گوێڕایەڵ وە ئافرەتانی خواپەرست و گوێڕایەڵ [ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ ] وە پیاوانی ڕاستگۆ و ئافرەتانی ڕاستگۆ [ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ ] وە پیاوانی ئارامگرو ئافرەتانی ئارامگر [ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ ] وە پیاوانی خۆبەکەمزان و ئافرەتانی خۆبەکەمزان، یان لە عیبادەتدا ملکەچ بۆ خوای گەورە [ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ ] وە پیاوانی خێرخوازو ئافرەتانی خێرخواز [ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ ] وە پیاوانی ڕۆژووەوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان [ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ ] وە ئەو پیاوانەی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن، وە ئەو ئافرەتانەیشی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن [ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ ] وە ئەو پیاوانەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە ئەکەن، وە ئەو ئافرەتانەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە ئەکەن لە هەموو حاڵەتێکیاندا، (پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: ئەگەر پیاو شەو هەستێت و خێزانەکەی هەستێنێت و دوو رکات نوێژ بکەن ئەوا لەو کەسانە ناونوس دەکرێن کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورەیان کردووە) [ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٣٥) ] ئا ئەمانە بە ژن و پیاوەوە خوای گەورە لێخۆشبوون و ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردوون..؟!

سێ یەم : راستگۆیی یان (الصدق ) سیفەتی پێغەمبەرانە – علیهم السلام – :

بەلێ یەکێك لە سیفەتە هەر گەورەکانی پێغەمبەران – علیهم السلام – ئەویش سیفەتی راگۆیی یان (الصدق ) بوو ، چونکە ئەوان لەلایەن (خوای گەورە ) پێیان فەرمانییان پێکراوە کە نامەیە یان ئەم رسالەیە بگەیەنن ، لە لایەن (خوای گەورە ) وە بە وەحی نیگا سپاردەی پێغەمبەران کراوە ، ئەوانیش دەبێت راست و راستگۆی رسالەکە بگەیەنن ، وە دەبێت لە رسالە کەیان راست راستگۆیی وەکو خۆی جێ بەجێ بکەن و پابەندی فەرمانەکان بن ، لە کردەوە و ووتەکانیان ، هەروەها (خوای گەورە ) دەربارەی راست گۆیی پێغەمبەران لە چەندین ئایەت دا باسی کردووە.

(خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ۝٥٢﴾ [یس : ٥٢] واتە: دوای ئەوەی ئەگەڕێنەوە بەلای عەقڵی خۆیاندا دان ئەنێن و ئەڵێن: ئەمە ئەو بە ڵێنە بوو کە خوای گەورە پێی دابووین، وە پێغەمبەرانیش ڕاستیان کرد کە وتیان: زیندوو بوونەوە هە یە، یان وتراوە: باوەڕداران و مەلائیکەتەکان وایان پێ ئەڵێن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ۝٤١﴾ [مَرْيَم : ٤١] واتە : {گفتوگۆی نێوان ئیبراهیم پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم -و باوکی} [ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ لەم قورئانە پیرۆزە باسی ئیبراهیم پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بۆ بت پەرستان بکە [ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا ] کە بەدڵنیایی ئەو کەسێك بووە کە زۆر ڕاستگۆ بووە، یان زۆر ئایەتەکانی خوای گەورەی بەڕاست داناوە، وە پێغەمبەری خوا بووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ۝٥٦﴾ [مَرْيَم : ٥٦] واتە: [ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - لەو قورئانە پیرۆزە باسی ئیدریس پێغەمبەریش - صلى الله عليه وسلم - بۆ خەڵکی بکە [ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا ] بە دڵنیایی ئەویش زۆر ڕاستگۆ بووە وە پێغەمبەری خوای گەورە بووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٣ - ٨٤] واته: [ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا ] ئەی پەروەردگار زانیاری و زانستێکی بەسوود یان پێغەمبەرایەتیم پێ ببەخشە [ وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ] وە بمگەیەنە بە پیاوچاکان لە بەهەشتدا..؟! [ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ] وە زمانێکی ڕاستگۆم پێ ببەخشە لە دونیادا کە ئەوانەی دوای خۆم دێن بە باشە باسم بکەن و لە چاکەدا شوێنم بکەون.

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾﴾ [مَرْيَم : ٥٤] واته: [ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - لەو قورئانە پیرۆزە باسی ئیسماعیل پێغەمبەریش - صلى الله عليه وسلم - بۆ خەڵکی بکە [ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ ] بە دڵنیایی ئەو کەسێك بووە کە لە وەعدو بەڵێنەکانیدا ڕاستگۆ بووەو هیچ بەڵێنێکی نەداوە ئیلا بردۆتیەسەر (هەرچەندە هەموو پێغەمبەران وابوونە بەڵام ئەم زیاتر پەیوەست بووە پێوەی بۆیە بە تایبەت باسکراوە) [ وَكَانَ رَسُولًا نَبِيًّا] وە پێغەمبەری نێردراوی خوای گەورە بووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴿٥٠﴾﴾ [مَرْيَم : ٥٠] واته: [ وَوَهَبْنَا لَهُمْ مِنْ رَحْمَتِنَا ] وە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆمان پێغەمبەرایەتی و ماڵ و منداڵ و کتابمان پێ بەخشین [ وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا] وە زمانی ڕاستگۆی بەرزمان پێ بەخشین، واته: لەسەر زمانی بەندەکان بە باشە باس دەکرێن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾﴾ [يُوسُف : ٤٦] واته: ئەی یوسفی هاوڕێی بەندینخانەم، یان زۆر ڕاستگۆ، لێکدانەوەی ئەو خەونەمان بۆ بکە کە حەوت مانگای لەڕ حەوت مانگای قەڵەو ئەخوات [ وَسَبْعِ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ ] وە حەوت گوڵە گەنمی سەوزو حەوتی وشك [ لَعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ] بەڵکو بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکی (پاشا) بەڵکو لێکدانەوەی خەونەکە بزانن..؟!

## ڕاستگۆیی لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ

**بەڵێ پێغەمبەری خوای ﷺ نموونەی هەموو سیفەتە جوانەکان بوو ، هەروەها پێشەنگ بوو لە سیفەتی ڕاستگۆیی یان (الصدق ) ، هەر وەکو بە ڕاستگۆ لە ناو خەلکەکەی دەناسرا پێش پێغەمبەرایەتی ، چونکە بە ناوبانگ بوو یان ناسراو بوو بە (الصادق لامين ) واتە : ئەمین و ڕاستگۆ ، وە ئەم نازناوەش بەردەوام تا هاتنی وەحی نیگا ، ئەو پەیامەش هەر بە ڕاست و دروستی لە لایەن (خوای گەورە ) بۆ دابەزی ..! ! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال** تعالى: ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ۝٥﴾ [النَّجْم : ٢ - ٥] واتە: [ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى] ئەمە وەڵامی سوێند خواردنەکەیە: کە ئەم هاوەڵەی ئێوە کە محمدە - صلى الله عليه وسلم - گومڕا نەبووە لەبەر نەزانی، وە لە حەق لای نەداوە لەسەر زانیاری، وە قسەی بەتاڵی نەکردووە..؟! [ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى] وە لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات بەڵکو ئەوەی کە دەیڵێ قورئانەو..؟! [ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى] تەنها وەحیەو لەلایەن خوای گەورەوە بە وەحی بۆی هاتووە..؟! [ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى] جبريل فێری کردووەو لەلایەن خوای گەورەوە هاتووەو وەحی بۆ هێناوە کە زۆر بەهێزەو هێزێکی زۆر سەختی هەیە ..؟!

**هەروەها شایەتی دانی (خوای گەورە ) بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستگۆیی هەر وەك دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ۝٣٣﴾ [الزُّمَر : ٣٣] واتە : [ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ ] وە ئەو کەسەی کە ڕاستی و تەوحیدو یەکخواپەرستی هێناوە کە پێغەمبەری خوایە -صلى الله عليه وسلم - ، یان جبريلە، یان سەرجەم پێغەمبەرانە [ وَصَدَّقَ بِهِ ] وە ئەوانەیشی کە بەڕاستیان داناوە، واتە: باوەڕداران، یان وتراوە: مەبەست پێی (ئەبوبەکری صديق)ە (خوای لێ ڕازی بێت) کە یەکەم کەس بوو ئیمانی هێناوە [ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ] ئا ئەمانە بەڕاستی کەسانێکی موتتەقی و لە خواترس و خۆپارێزن..؟!

له (الحسن بن على بن ابي طالب) — خوا لیّ رازی بێت — دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((دع ما يَريبكَ إلى ما لا يَريبُكَ، فإنَّ الصِّدقَ طُمأنينةٌ وإنَّ الكذبَ رِيبةٌ)).[11] واتە : واز لەوە بهێنە کە دەتخاتە گومانەوە ، بۆ شتێك کە ناتخاتە گومانەوە ، چونکە بێ گومان راستگۆیی دلنیاییە ، درۆ دەلە سەش دوو دلی یە یان قەلەقیو رارایيە ..؟!

له ( أنس بن مالك ) — خوا لیّ رازی بێت — دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أنَّ رجلاً أتى النبيَّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ فقال : يا رسولَ اللهِ، احمِلْني ، قال النبيُّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ : إنا حاملوكَ على ولدِ ناقةٍ. قال : وما أصنع بولدِ الناقةِ ؟ فقال النبيُّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ : وهل تلدُ الإبلَ إلا النوقُ )) .[12] واتە: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ووشترێکی لیّ کرد و بۆ سواری ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من بەچکە ووشترێکی مێیینەت دەدەمیّ ، ئەویش ووتی : جا چی لە بەچکە ووشترێك بکەم بەکەلکی سواری نایەت ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئایا گەورە بچووکیان بەچکەی ووشتر مێ نین ..؟!

---

[11]-سنن الترمذي برقم (٢٥١٨).
[12]-سنن ابو داود برقم (٤٩٩٨).

چوارەم : راستگۆی یان (الصدق) سیفەتی چاکە کارانە :

(خوای گەورە ) بە چەندین سیفەت ، وەك سیفەتە چاك و باشەكان وەسفی بەندە دلسۆزەكانی خۆی دەكات ، كە بە بەها ترین و گەورەترین سیفەت سیفەتی راستگۆیی یە ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾ [التَّوْبَة : ١١٩]واتە : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بكەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩) ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟!

بەلێ (ابن كثير ) لە تەفسیرەكەی دا باسی كردووە ، دەلێت : كاتێ (خوای گەورە ) باسی ئەو سێ كەسەی كرد كە چۆن دەرگای لێكردنەوە و رزگاری كردن لە نەهامەتی و تەنگانەو نارحەتیە لە دوورەپەرێزی موسلمانان لێیان بۆ ماوەی پەنجا شەو بە رۆژەكانیشیەوە وایان لێهات لە خۆیان بێزار بوون ، ئەم سێ كەسە لە ئایەتی پێشتر ئاماژەی پێدەكرێت كە ئەمانە بوون ، ( كەعبی كوری مالك ) و (هیلالی كوری ئەمەییە ) و (مرارەی كوری رەبیع ) بوون ..! ! بەلێ ئەمانە ئەم سەر زەویەیان بەو فراوانیەوە لێهاتە یەك واتە: لەگەل ئەو فروانیەدا سەریان لێ شێواو بوو نەیان دەزانی چی بكەن و بۆ كوێ بچن ..! ! ئەوان خۆیان لە بەر فەرمانی (خوای گەورە ) راگرت و ملكەچی فەرمانی (خوای گەورە ) بوون ، لەسەری راوەستان هەتاكو (خوای گەورە) دەرگایی خێری لێكردنەوە ، بە هۆی راوەستانیان لە گەل پێغەمبەری خوا ﷺ سە بارەتە بەم دواكەتنەیان لە (غەزای تبوك ) چونكە ئەوانە چووبوونە دەستەی دوو رووەكانەوە ، هەروەها ئەوانە هیچ برو بیانوویەكیان نەبوو بۆ دواكەتن لەم غەزایە ، ئەوە بوو ئەمانە سزا دران ئەو ماوەیە لەسەر ئەو دواكەوتنە یان لە جیهاد كردن لە پێناوی (خوای گەورە) سەركەوتنی موسلمانان ، پاشان (خوای گەورە ) توبەی لێ قبول كردن ، ئاكامی ئەم راستیەیان بە خێر دەرچوو ، پاشان (خوای گەورە ) لەم سێ كەس خۆشبوو ...



هەر بۆیە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ [التَّوْبَة : ١١٩]واتە : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩) ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟! یان واتە : راستگۆ بن ، پابەند بن بەراستیەوە ، لە ریزی راستان دەبن ، لە ناخۆشی و هەلدێرەکان رزگارتان دەبێت ، (خوای گەورە) بەم راستگۆیەتان لە کارەکانتاندا دەرووتان لێدەکاتەوە و رزگارتان دەکات ، هەروەك ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێشتر باسمان کرد (ئیمامی احمد) – رەحمەتی خوای لێ بێت – ریوایەتی کردووە وە لە هەردوو صحیحەکەش هاتووە ..؟!

عن (عبدالله بن مسعود ) – رضي الله عنه – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدي إلى البر ، وإن البر يهدي إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وغن الكذب يهدي إلى الفجور ، وإن الفجور يهدي إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[١٣]

واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان راستگۆ بن بە راستی راستگۆیی مرۆڤ رێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش رێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە راست دەکات و بەدوایی راستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە راستگۆ تۆمار دەکرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەراستی درۆ مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت ..؟!) بەلێ راستگۆیی کاریگەری هەیە لە سەر بەندەی ئیماندار یان لە سەر راستگۆیان ، ئەویش کە ئەو راستیە سەر سورهێنەی کە لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدی دەکرا ، چونکە ئەوان لە گەل پێغەمبەرەکەیان ﷺ زۆر راستگۆ بوون ، پێغەمبەرەکەیان بەراستگۆ دەزانی لە هەر هەلوێستێك و کارێك کە ئەنجامی دەدا ، چونکە هاوەلان – خوا لێیان رازی بێت – دلسۆزترین کەس بوون لە ئیماندا وە راستگۆ ترین کەس بوون لە یەقین و دلنیاییدا هەروەها بە وەفا ترین کەس بوون بۆ پێغەمبەرەکەیان ﷺ ...

---

[١٣]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).

هەر بۆیە هاوەلان پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو بارودۆخێکدا راستگۆیی خۆیان نیشاندەدا ،یەکێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەویش بە راستگۆ ناوبانگی دەرکردووە یان نازناوی (ابو بکر صدیق )– خوا لێ رازی بێت ، کە یەکێکە لە هاوریٚ هاوەل و هاودەمی پیغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کات و ساتەکاندا ، هەروەها هاوریٚ کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە کۆچی کرد لە شاری مککە بۆ شاری مەدینە ، هاوریٚ ئەشکەوتی (سوور) بوو، وە ئەو کاتەی کە پێش کۆچ کردنیان لە مککە بۆ شاری مەدینە ، ڕووداوێك ڕوویدا ئەویش ئەوە بوو کە ڕووداوی (الاسراء و المعراج ) بوو ، ئەوە بوو پیاوێك لە موشریکە کان یان کافرانی قورەیش گەیشت بە (ابو بکر صدیق ) پیٚ ووت :هاوەلەکەت واتە:( پێغەمبەری خوا ﷺ یان محمد ﷺ ) دەلێت : من ئەم شەو چوویمە (بیت المقدس ) وە گەرایمەوە لە یەك شەو دا ، وە ئێمە مانگێك جەرگی ووشترمان لێدا لە پێش لە دواوە ، ئەویش فەرمووی : ئایا ئەو وای فەرمووە ..؟! پیاوە کافرەکەش ووتی : بەلیٚ . (ابو بکر صدیق ) فەرمووی : ئەگەر وای فەرمووە راستی کردووە ، منیش زیاتر لەوەی کە تۆ دەلێت : باوەرم پێی هەیە کە راست دەکات ..! ! هەروەها (ابو بکر صدیق ) – خوا لیٚ رازی بێت – فەرمووی : من باوەرم پێیەتی کە هەوالی ئاسمانی بۆ دێت ، وە نازناویشی (صدیق ) وە بە راستگۆ (صادق الامین ) بەناوبانگە..؟! هەروەها (خوای گەورە ) دەربارەی ئیمانداران لە چاکەکارانی وەك : کۆچ کەرە هەژارەکان و راستگۆیان و ئەنصارەکان باسی کردوون ، چونکە ئەم ئایەتە دەرخەرو شایەتی دانی (خوای گەورە )یە بۆ هاوەلان کە لە کۆچکەران راستگۆیان و ئەنصارەکان ، کە مەبەستیان تەنها رەزامەندی (خوای گەورە ) بووە ، هەروەك دەفەرموویٚت :

قال تعالى: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ [الحَشر : ٨] واتە: [ لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ] ئەو فەقیرە کۆچکەرانە کە لە مەککەوە لە شوێن و ماڵ و سامانی خۆیان دەرکران لەلایەن کافرانەوە مەبەستیان دەستکەوتنی فەزڵی خوای گەورە بووە بەوەی کە خوای گەورە ڕزقیان بدات لە دونیا، وە مەبەستیان ڕەزامەندی خوای گەورە بووە لە قیامەتدا دەستیان بکەوێ و خوا لێیان ڕازی بێ، (ئەم ئایەتە شایەتیدانی خوای گەورەیە بۆ صەحابە کۆچکەرەکان کە مەبەستیان ڕەزامەندی خوای گەورەیە) [ وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ] وە خواو پێغەمبەری خوایان - صلى الله عليه وسلم - سەرئەخست بەوەی کە جیهادیان ئەکردو بەرگریان لە دینی خوای گەورە ئەکرد [ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) ] بەڕاستی ڕاستگۆی تەواو و ڕاستەقینە ئەمانەن [ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ ] وە ئەنصاریەکان کە جێگیرو نیشتەجێ بوونە لە مەدینە پێش موهاجیرەکان، وە ئیمانیان هێناوە بە خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ..؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕاستگۆیی بۆ مان ڕوون دەکاتەوە ، لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بازرگانێك یان هەرکەسێك لە کارەکەی خۆی ڕاستگۆ بێت ، ئەوا ئەم ڕستگۆییە دەبێتە هۆکارێك بۆ سەرفرازی و سەرکەوتن لە دونیا و لە قیامەتدا ..؟!

لە (رفاعة بن عرابة الجهني )– خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : ((أنَّهُ خرجَ معَ النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ فرأى النَّاسَ يتبايَعونَ فقالَ يا معشرَ التُّجَّارِ فاستجابوا لِرسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ ورفَعوا أعناقَهم وأبصارَهم إليهِ فقالَ إنَّ التُّجَّارَ يُبعثونَ يومَ القيامةِ فُجَّارًا إلاَّ مَن اتَّقى اللَّهَ وبَرَّ وصدقَ )).[١٤] واتە : کە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دا دەرچوو بۆ جێگای نوێژ ، تەماشای کرد خەلکەکە سەر قالی کڕین و فرۆشتنن ، فەرمووی : ئەی کۆمەلی بازرگانان ..؟! خەلکەکە سەریان بەرز کردەوە و ڕوویان کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و گوێیان بۆ ڕاگرت ، ئەویش فەرمووی : بێ گومان لە ڕۆژی قیامەتدا بازرگانان زیندوو دەکرێنەوە هەموویان بەد کارن ، ئەوانەیان نەبێ لە خوا دەترسن و خێر و چاکە دەکەن و ڕاستگۆ و سەر ڕاستن ..؟!

لە (عبدالله کوری عباس )– خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت : ئەم چوار ڕەوشتە لە هەر کەسێك دابێت ، ئەوا براوە و سەرفرازو سەرکەوتووە ، وە ئەم ڕەوشتانە :( الصدق ، الحياء ، الحسن الخلق ، والشكر ) واتە: ڕاستگۆیی ، حەیا یان ئابروو ، ڕەوشتی باش ، وە سوپاسگوزاری ..؟!

بەلێ دەبێت لە ئیمانماندا لە گەل (خوای گەورە ) دا ڕاستگۆ بین ، لە دلسۆزیماندا لەگەل (خوای گەورە ) ڕاستگۆ بین ، لە کارەکانماندا لە ژیانی ڕۆژانەدا لە گەل (خوای گەورە ) ڕاستگۆ بین ، چونکە ڕزگار بوون لە سزایی (خوای گەورە ) لە دونیا و لە قیامەت تەنها ڕاستگۆییە ..!! بۆ ئەوەی پابەندی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ئایینەکەی و پێغەمبەرەکەی ﷺ بین ، بۆیە دەبێت جیاواز بین لە کافران و دووڕووەکان چونکە دل و زمانیان هەر هەموو درۆ کردنە ، چونکە ئیماندار ڕاستگۆیە لە گوفتارو کرداری و هەلسوکەوتی دا ..؟!

---

[١٤]- السنن الترمذي برقم (١٢١٠).

پێنچەم: دوعاو پارانەوەی چاکەکاران بەوەی بگەن بە راستگۆیان :

**نموونەیەکی جوان وباش کە دواکردنی (ابراهیم ) – علیه السلام – دوعاو پارنەوەی لە (خوای گەورە ) بەوەی بگات بە پێگەو مەنزیلەی چاکەکاران و وە زمانی پاراوبکا لە سەر راستگۆیی..؟!**

**(خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ٨٣ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ٨٥﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٣ – ٨٥] واتە : [ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا ] ئەی پەروەردگار زانیاری و زانستێکی بەسوود یان پێغەمبەرایەتیم پێ ببەخشە [ وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) ] وە بمگەیەنە بە پیاوچاکان لە بەهەشتدا..؟! [ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ (٨٤) ] وە زمانێکی ڕاستگۆم پێ ببەخشە لە دونیادا کە ئەوانەی دوای خۆم دێن بە باشە باسم بکەن و لە چاکەدا شوێنم بکەون..؟! [ وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) ] وە لە قیامەتدا بمکە بە میراتگری بەهەشتێك کە پڕ لە نازو نیعمەتە..؟!

**بەڵێ راستگۆیان ئەهلی ئەیمان و یەقین و جیهادو تێ کۆشانن ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ [الحُجُرَات : ١٥] واتە: [ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ] تەنها ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە ئیمانیان بە خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - هێناوە [ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ] پاشان هیچ گومانێك تێکەڵ بەو ئیمانەیان نەبووە وە جیهادیان کردووە لە پێناو خوای گەورە بە ماڵ و گیانیان [ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ] ئا ئەو کەسانە ڕاستگۆن لە ئیمان هێنانیان، نەك ئەو دەشتنشینانەی کە بانگەشەی باوەڕ دەکەن..؟!

بەڵێ ڕاستگۆیان هەمیشە وەڵامی دوعاو پارانەوەکانیان دەبێت ، بە ئیزنی (خوای گەورە) پاداشتیان وەردەگرنەوە بەدلنیاییەوە ، تەنانەت ئەگەر بەندەش نەتاوانی کارێك بکات بەلام لە دلە و مەبەستی بووە ، ڕاستگۆو دلسۆز بووە بۆ کاری خێرو چاکە ..!هەروەك م ئەم فەرموودەیە.

لە (سهل بن حنيف ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :
((مَن سَأَلَ اللَّهَ الشَّهادَةَ بصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنازِلَ الشُّهَداءِ، وإنْ ماتَ علَى فِراشِهِ )) .[١٥]
واتە: هەر کەس بەڕاستی دوایی شەهید بوون لە (خوای گەورە ) بکات ، ئەوا (خوای گەورە) دەیگەیەنێ بە پلەی شەهیدان ، ئەگەر لە سەر جێگەی خۆشی بمرێت ..؟!

بەڵێ بە دلنیایەوە کەسانی ڕاستگۆ لە کارو کردەوە و کرین و فرشتن دا دە گەیشتە بە ئامانجی نیعمەتی ڕاستگۆیی ئەویش بەرەکەت لە سەر کارەکەی و بەرەکەت و نیعمەت لە کرین و فرشتنە کەی پاداشتی ڕزق ڕۆزی حەلال لە سەری وەردەگرێت ، وە لە کارەکەشی هەمیشە و بەردەوام سەر کەوت و سەرفراز دەبێت ، (خوای گەروە ) کارەکەی و کرین و فرۆشتنەکەی بۆ ئاسان دەکات ، چونکە بە دلسۆزی بە ڕاستگۆیانە ئەنجامی داوە ، بۆیە هەمیشە موفق دەبێت ..؟!

لە ( حکيم بن حزام ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
((البَيِّعانِ بالخِيارِ ما لم يَتفرَّقَا، فإنْ صدَقَا وبَيَّنَا بُورِكَ لهما في بَيعِهما، وإنْ كذَبَا وكتَمَا مُحِقَتْ بَرَكةُ بَيعِهما)) .[١٦] واتە: کڕیار و فرۆشیار هەر یەکێکیان بۆ خۆیان سەر پشکن لە سەوداو مامەلە گەیاندا هەتا جیادەبنەوە ، جا ئەگەر ڕاستگۆ بوون و شتەکانیان بە جوانی خستە ڕوو ئەوە خێرو بەرەکەت دەکەوێتە سەو داو مامەلە کانیانەوە ، ئەگەر درۆشیان کردو ڕاستیەکەیان شاردەوە ئەو خێرو بەرەکەت لە مامەلەکەیاندا نامێنێت ..؟!

[١٥]-صحيح مسلم برقم (١٩٠٩).
[١٦]السنن الترمذي برقم (١٢٤٦).

شەشەم :(خوای گەورە ) ستایشی خەلکانی راستگۆ دەکات :

**بەلیٚ (خوای گەروە ) بە چەندین سیفەت و وەسف کردنی باش ستایشی بەندە دلسۆزەکانی دەکات ، کە گەورە ترین بە بەهاترین سیفەت سیفەتی راستگۆیی یە ، هەر وەك دەفەرموویٚت :**

قال تعالى: ﴿ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾﴾ [الْأَحْزَاب : ٢٣ - ٢٤] واته: [ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ] (ئەنەسی کوڕی مالیك) دەفەرمێت: (ئەنەسی کوڕی نەزری) مامم لە غەزای (بەدر) بەشداری نەکرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئامادەی یەکەم غەزا نەبووم کە کوشتاری کافرانت کرد ئەگەر خوای گەورە یارمەتیم بدات ئامادە بم لە کوشتاری کافران دەمبینێت کە چی دەکەم، لە غەزای (ئوحود)دا کە موسڵمانان تێکشکان، وتی: خوایە من داوای لێبوردنت لێدەکەم کە هاوڕێکانم تێکشکان، وە بەریم لەوەی کە کافران دەیکەن، پاشان چووە پێشەوە (سەعدی کوڕی موعاز) پێی گەیشت، وتی: ئەی (سەعدی کوڕی موعاز) سوێند بێت بە خوای باوکم من بۆنی بەهەشت دەکەم لە لای (ئوحود)هوە، (سەعد) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەوەی (ئەنەسی کوڕی نەزر) کردی من نەمتوانی بیکەم، (ئەنەس) دەفەرمێت: بینیمان هەشتاو ئەوەندە برین بە لەشیەوەیە کە بە شمشێرو رم و تیر لێیدرابوو، وە کوژرا بوو وە لاشەی شێوێنرابوو کەس نەیناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت بە سەرەپەنجەکانی ناسیەوە، (ئەنەس) دەفەرمێت: ئەم ئایەتە لەسەر (ئەنەسی کوڕی نەضر)و هاوشێوەکانی دابەزیوە: لەناو پیاواندا کەسانێك هەن کە ڕاستگۆ بوونە لەو بەڵێنەی کە بە خوای گەورەیان داوە کە بەرگری لە دینی خوای گەورە بکەن [ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ ] جا هەیانبووە بەڵێنەکەی جێبەجێ کردووە کە بەڵێنیان داوە کە بگەن بە دوژمن کوشتاریان بکەن، یاخود مردوونەو شەهید بوونە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: (طلحة لەم کەسانەیە) [ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ ] وە هەشیانە چاوەڕێیە کە ئەجەلی بێت و لە پێناو خوای گەورە بکوژرێ [ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ] وە ئەو بەڵێنەی کە بە خواو پێغەمبەری خوایان داوە - صلى الله عليه وسلم - نەیانگۆڕیوەو بەردەوام بوونە لەسەری ..؟! [ لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ ] تا خوای گەورە پاداشتی ڕاستگۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستگۆییانەوە کە باوەڕدارانن [ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ ] وە سزای مونافیقان بدات ئەوەی کە ویستی لێ بێت و بەردەوام بێت لەسەر نیفاق [ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ] یان لێیان خۆشبێ لەوانەی کە تەوبە دەکەن [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا ] بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییە..؟!

بەڵێ بەدڵنیایەوە (خوای گەروە ) پاداشتی راستگۆیان دەداتەوە بە چوونە نێو بەهەشتەکەی کە پرە لە دارو درەخت و کە رووبار بە ژێریاندا دەروات ، ئەویش بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دونیادا راستگۆ و دلسۆز بوون بۆ ئایینەکەی (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی ﷺ کە راستگۆیانە پەروەردگاری خۆیان دەپەرست ، لەگەل خەلکی مامەلەی چاکە راستگۆیانەیان ئەنجام دەدا..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩﴾ [المَائـِدَة : ١١٩] واته: [ قَالَ اللَّهُ هَذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ] خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانەی کە لە دونیادا ڕاستگۆبوونە ئێستا ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ ئەگەیەنێ، (ابن عباس) ئەفەرمێت: ڕۆژێکە یەکخواپەرستی سود بە یەکخواپەرستان دەگەیەنێت [ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ] ئەوە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە ئەیانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات و جۆگەلە ئاو بەژێر خانو دارەکاندا تێ ئەپەڕێ [ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ] بەهەمیشەیی و بەنەمری تیایدا ئەمێننەوە [ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ] خوای گەورە لێیان ڕازیە بەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیا کردوویانە [ وَرَضُوا عَنْهُ ] ئەوانیش بەو بەش و پاداشتەی کە خوای گەورە ئەیانداتێ پێی ڕازین کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتووە [ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ] ئا ئەمە بردنەوەی هەر گەورەیە کە مرۆڤ بچێتە بەهەشتەوە..؟!

بەڵێ هەندێك لە زانایان پێیان وایە کە پێگەو مەنزیلەی راستگۆیی لە بەرزترین پلە و مەنزیلەیەکی زۆر گەورەیە ، تەنانەت پێگەو مەنزیلەی راستگۆ لە پێگەو مەنزیلەی پێغەمبەران –علیهم السلام– دایە ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واته: [ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ] پیاوێك لە ئەنصارییەكان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - كە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فڵانە كەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - شتێكە بیرم لێ كردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەكەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگە

ین، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات- صلى الله عليه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان [ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا (٦٩) ] کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی و هاوەڵێتیان بکات..؟!

عن (عبدالله بن مسعود ) ﵁ – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدي إلى البر ، وإن البر يهدي إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وغن الكذب يهدي إلى الفجور ، وإن الفجور يهدي إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[١٧]

واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان ڕاستگۆ بن بە ڕاستی ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش ڕێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەکات و بەدوایی ڕاستیدا گەڕێت ، تا لای خوا بە ڕاستگۆ تۆمار دەکرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەڕاستی دۆر مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت ..؟!)

[١٧]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).

## حقیقەتی ڕاستگۆیی و بوارەکانی

وەك باسمان کرد راستگۆیی لە زمانی عەرەبیدا پیێ دەوترێت : (الصدق ) ، هەروەها زانایان دەلێن : (الصدق هو ضد الکذب) واتە: راستگۆیی ریێك پێچەوانەی درۆکردنە ، بە جۆریێك کە هەر گیز لە یەك کاتدا بەیەکەوە لە دلیێکدا کۆنابنەوە ..؟!

راستگۆیی رەوشتێکی بەرزە ، چونکە یەکێکە لە گرنگترین رووەشتە بەرزەکانی ئایینی ئیسلام و موسلمانان ، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە تەقوادارو بانگەوازی ئایینی ئیسلام دەکەن ، ئەمەش بنچینە بناغەی ئایینی ئیسلام کە راستگۆ بین ، چونکە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە کانیاو کانگە و سەرچاوەی گشت رەوشت ئەدەب بەها بەرزەکان دادەنرێت ، زۆر دووپات دەکاتەوە لە سەر راستگۆیی هانی گشت خەلکی ئەم جیهانە دەدات کە خۆیان بەم ئاکارە جوانەو برازێننەوە ، هەروەها راستگۆیی بە کۆلەکە بناغەو بنیاتی ئیمان و باوەر داناوە ، چونکە باوەر هێنان بە بیێ راستگۆیی هیچ بە هایەکی نیە ناچەسپێت و وەرناگرێت ..؟!

(خوای گەورە ) فەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە : طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَعْرُوفٌ ] ئەگەر گوێڕایەڵی خوای گەورەیان بکردایە وە وتەی باشیان بوتایە ئەمە باشتر بوو بۆیان [ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ ] وە کاتێك کە کارەکە جدی بوو، وە کوشتاری کافران دەستیپێکرد [ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ ] ئەگەر لەگەڵ خوای گەورە ڕاستیان بکردایەو ئیمانیان بهێنایەو گوێڕایەڵی خوای گەورەیان بکردایە ئەوە بۆیان باشتر بوو لەوەی کە سەرپێچی خوای گەورە بکەن..

## بوارەکانی راستگۆیی ئەم خالانەی خوارەوە دەگرێتەوە

یەکەم : راستگۆیی نیەت و ئیرادەیە :

بەڵێ کاتێك مرۆڤ لەم ژیانەدا هەر کارێك ئەنجام دەدات ، پێویستە نیەتی خۆی یان دلسۆزی خۆی یەك لای بکاتەوە تەنها لە پێناوی (خوای گەورە ) کارەکەی ئەنجام بدات ، وە ئەنجامدانی هەر کارێکیش پێویستی بە راستگۆیی هەیە چونکە راستگۆیی لە هەر کارو کردەوەیە دەبێتە رەزامەندی یان قبول بوونی کارەکە لە لایەن (خوای گەورە ) ، وەکاتێك رەزامەندی (خوای گەورە) بەدەست هێنارا ئەوا ئەم کارو کردەوەیە دەبێتە کارێکی چاکە و بەرهەمدار دەبێت لە دونیا و لە قیامەتدا ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾ [البَيِّنَة : ٥] واته: {فەرمان کردن بە یەکخواپەرستی} [ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] وە ئەهلی کتاب فەرمانیان پێ نەکرابوو تەنها بەوە نەبێ بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن بە ئیخلاص و دڵسۆزی و نیاز پاکییەوە وە شەریکی بۆ دانەنێن [ حُنَفَاءَ ] وە لە شیرك لادەن و بێنە سەر تەوحید [ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ ] وە نوێژەکانیان ئەنجام بدەن لە کاتی خۆیدا بە ڕوکن و واجیبات و مەرجەکان و خشوعەوە [ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ] وە زەکاتی ماڵەکانیان بدەن و چاکە لەگەڵ فەقیرو هەژارو نەداراندا بکەن [ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ (٥) ] وە دینی ڕێك و ڕاست و دامەزراو و چاك ئەمەیە کە مرۆڤ بەتاك و تەنها خوا بپەرستێ و شەریك بۆ خوا دانەنێ وە نوێژەکانی ئەنجام بدات وە زەکاتی ماڵەکەی بدات..؟!

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مان روون دەکاتەوە ، کەوا راستگۆیی لە نیەت دلسۆزیی دا بنچینەی قبول بوونی کارو کردەوە چاکەکانە ، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان باس دەکات.

لە پێشەوا ( عمری کوری خطاب ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إنّما الأعمالُ بالنّيّاتِ وإنّما لِكلِّ امرئٍ ما نوى فمَن كانَت هجرتُهُ إلى اللَّهِ ورسولِهِ فَهجرتُهُ إلى اللَّهِ ورسولِهِ ومن كانت هجرتُهُ لدنيا يُصيبُها أوِ امرأةٍ يتزوَّجُها فَهجرتُهُ إلى ما هاجرَ إليْهِ )) .[١٨]

---

[١٨]-السنن ابو داود برقم (٢٢٠١).

واتە: ئەو کارو کردەوانەی پاداشت و تۆڵەیان لە سەرە بە پێی نیەت یان نیازو دڵسۆزیی مەبەستەکانن ، بێ گومان هەموو کەسێك بە گوێرەی نیەت و نیازو دڵسۆزیی و مەبەستی خۆی پاداشت و تۆڵەی بۆ دەسێنرێت ، هەر کەسێ مەبەستی کۆچکردنەکەی لە مککەوە بۆ مەدینە بۆ ڕەزامەندی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ بێ ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ڕەزامەندی (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ و بە پاداشتی خۆی دەگات ، وە هەر کەسێ مە بەستی کۆچکردنەکەی بۆ کارێکی دونیایی بێ یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێ بێ ئەوە کۆچکردنەکەی بە پێی نیەت و نیازەکەیەتی و خێری ناگات ..؟!

بێ گومان ڕاستگۆیی پەیوەندیەکی یەکجار زۆری هەیە بە دڵسۆزیی نیەتەوە ، بەمانایی ئەوەی هیچ هۆکارێك نیە بۆ هەرکارێك جگە لە نیەت باشی دڵسۆزی نەبێت ، وە ڕەزامەندی (خوای گەورە )ی لە سەر بێت ، هەروەها ڕاستگۆیی و نیەت پاکی ئامانجی ئەو کەسانە نوێ دەکاتەو کە بەر پرسیارن لە هەر کارێك کە ئەنجامی دەدن ..! !چونکە ئەگەر یەکێك لەو مەبەستانەی باسمان کرد دەربچێت ئەوا ئەوا لە نەفسی خۆی نیەت و دڵسۆزیەکەی پووچەڵ یان باتڵ دەبێت ..؟!

هەروەهاپێغەمبەری خواﷺئامازەی پێدەکات بۆمان باسی نیەت ودڵسۆزی دەکات لەکردەوەکان

لە (ابو هريره ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أوَّلُ النَّاسِ يُقضَى لَهُم يومَ القيامةِ ثلاثةٌ : رجلٌ استُشْهِدَ فأتىَ بِهِ فعرَّفَهُ نعمَهُ فعرفَها، قالَ : فما عمِلتَ فيها ؟ قالَ : قاتلتُ فيكَ حتَّى استُشهِدتُ، قالَ : كذَبتَ، ولَكِنَّكَ قاتلتَ ليقالَ فلانٌ جرىءٌ ، فقد قيلَ، ثمَّ أمرَ بِهِ، فسُحِبَ على وجهِهِ حتَّى أُلْقىَ فى النَّارِ، ورجلٌ تعلَّمَ العِلمَ وعلَّمَهُ، وقرأَ القرآنَ فأتىَ بِهِ فعرَّفَهُ نعمَهُ فعرفَها، قالَ : فما عمِلتَ فيها ؟ قالَ : تعلَّمتُ العلمَ وعلَّمتُهُ، وقرأتُ فيكَ القرآنَ، قالَ : كذبتَ، ولَكِنَّكَ تعلَّمتَ العلمَ ليقالَ عالمٌ، وقرأتَ القرآنَ ليقالَ قارئٌ، فقد قيلَ، ثمَّ أمرَ بِهِ، فسُحِبَ على وجهِهِ حتَّى أُلْقىَ فى النَّارِ، ورجلٌ وسَّعَ اللَّهُ عليهِ وأعطاهُ من أصنافِ المالِ كلِّهِ، فأتىَ بِهِ فعرَّفَهُ نعمَهُ، فعرفَها، فقالَ : ما عمِلتَ فيها ؟ قالَ : ما ترَكْتُ من سبيلٍ تحبُّ قالَ أبو عبدِ الرَّحمنِ : ولم أفهَم تحبُّ كما أردتُ أن ينفقَ فيها إلاَّ أنفقتُ فيها لَكَ، قالَ : كذَبتَ ولَكِن ليقالَ إنَّهُ جوادٌ ، فقد



قيلَ، ثمَّ أمرَ بِهِ، فسُحِبَ علَى وجهِهِ، فأُلْقِيَ فِي النَّارِ)) .[19] واتە: یەکەم کۆمەل دادگەری دەکرێن لە ڕۆژی قیامەتدا یان لە ڕۆژی دواییدا سیانن : پیاوێك شەهید بووە دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ نیشان دەدرێ یان پێی دەناسرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ ، پێی دەلێ : تۆ چیت کردووە تیایدا ..؟! ئەویش دەلێت : جەنگم کردووە تاکو شەهید بووم ..!! ئینجا (خوای گەورە) یان فریشتە پێی دەلێ : درۆت کرد ، بەلکو جەنگت کرد بۆ ئەوەی پێت بلێن کەسێکی پالەوانی یان بوێری ..؟! بێ گومان ئەو ناوەت پێ ووترا ..!! پاشان فەرمان دەکرێ لە سەر دەم چاوی یان روخساری رابکێشن و فرێ بدرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە ، وە پیاوێك فێری زانست بووەو خەلکێشی فێر کردووە و قورئانیشی خوێندوە ، دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ نیشاندەدن یان پێ دەناسێنرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ ، دەلێ : کارت پێ کردوون ..؟! دەلێ : فێری زانست بووم و خەلکیشم فێر کرد ، قورئانیشم خوێند ، (خوای گەورە ) یان فریشتە پێی دەلێ : درۆت کرد ، بەلکو فێری زانست بوی بۆ ئەوەی پێت بلێن : زانایە ، وە قورئانت خوێند بۆ ئەوەی پێت بلێن : قورئان خوێنە ، بێ گومان پێت وترا ، پاشان فەرمان پێدەکرێ لەسەر دەم و چاوی یان روخساری را دەکێشرێ و دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە ، وە پیاوێك (خوای گەورە ) مال و سامانی پێ بەخشیوە بە هەموو جۆرەکان ، دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ نیشاندەدرێ یان پێی دەناسێنرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ ، دەلێ : چۆن کارت پێی کردووە ..؟! دەلێ : ئەوەی جێم هێشتووە لە پێناوی خۆشەویستی تۆیە ئەی پەروەردگار ..!! " (ابو عبدالرحمن ) دەلێ : تێنەگەیشتم وابزانم ووتی : ئەوەی تۆ پێت خۆشە لەو پێناوەدا بەخشیم (خوای گەورە) یان فریشتە پێی دەلێ : درۆت کرد ، بەلکو لەبەر ئەوەی پێت بلێن کەسێکی بەخشندەیە ، بێ گومان پێت ووترا ، پاشان فەرمانی پێ دەدرێ لە سەر دەم چاوی یان روخساری رادەکێشرێ بۆ نێو ئاگری دۆزەخەوە ..؟!

لە(عبادەی کوری صامت ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەو لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَن غَزَا فِي سبيلِ اللهِ ولم يَنْوِ إلا عِقالاً؛ فله ما نَوَى)) .[20] واتە: هەر کەسێك لە پێناوی (خوای گەورە ) جیها یان غەزا بکات نیەتی ئەوەی بێ گوریسێکی دەست بکەوێ ئەوە بە پێ نیەتە کەی خۆیەتی ..؟!

[19]- السنن النسائي برقم (٣١٣٧).
[20]-السنن النسائي برقم (٣١٣٨).

دووەم : ڕاستگۆیی ئاشکرا لەگەڵ پەناهایی و نادیار دا:

بەڵێ ڕاستگۆیی به واتای هاوتاکردنی ئاشکرا بە پەناهایی و نادیارەکان لە ناوەوی نەفسدا ، وەك گوفتارو کردارەکانی مرۆڤ ، بۆئەوەی گوفتارو کردار لە گەڵ یەکتر گەنجاو بن و هاوتایەکتری بن ، چونکە دەبێت مرۆڤی موسلمان لە تەواوی جووڵە و گوفتاریدا هاوتایی یەکتری بن ، چونکە نابێت هیچ شتێکی شاراوە و نادیاری نیە ، جگەوەی کە هەیەتی دەبێت دەرکەوێت و ئاشکرایی بکات ، بەم واتایەی دەبێت ناوەوە دەرەوەی وەك یەکتری بێت گوفتارو کرداری نابێت پێچەوانە یان دژ بەیکتری بێت ..!! هیچ شتێکی تر هەوال نادات جگە لەوەی کە ڕوویداوە ، ئەوەی لە گوفتاری دەرناکات کە ئەنجامی کارەکەی نەدان ، یان بە مانایەکی تر ئەوە پەیمان و وعد نادا بە گوفتار ئەگەر ئەنجامی نەدات ، ئەوەی دەڵێ بەدڵنیایەوە ئەنجامی دەدات بە نیەت پاکی و دلسۆزی کاری بۆ دەکات ، هەر بۆ ئەمەبەست (خوای گەورە ) کارەکانی بۆ ئاسان دەکات ، وەك کە باسمان کرد ناوەوە دەرەوەی یان مرۆڤ وەك یەکتری بن هاوتایەکتری بن ئەوا بێ گومان گەورە ترین سیفەت و ڕەوشتی مرۆڤە ، چونکە بە ویژدانێکی پاك و دەروونێکی پڕ لە بەختەوەری و ئاسوودەیەوە دەژی ، بەلام بە درۆ کردن و دوو ڕوویی دوو وجە یان دوو ڕوخساری ئەوا هەمیشە و بەردەوام نەفسی ئاسوودە نابێت و لە ژیاندا مرتاح بەختەوەری هەرگیز ڕووی تێناکات ، چونکە پێچەوانەی مرۆڤی ڕاستگۆ دەژین ، هەمیشە بۆ درۆکانی تووشی نارەحەتی زەلیلی ریسوایی و سەرشۆری ڕوو ڕەش بوون دەبێتەوە بە کەسێکی سووك ریسوا لە نێو خەلکی دا ناوزەند دەکرێ،

چونکە منافقەکان یان دوو ڕووەکان هەمیشە پێچەوانەی دەرەکی و ناوەکیەکانی نەفسی خۆیان بوون ، چونکە ئیمانیان ئاشکرا دەکرد ، بەلام لە ناوەوە کوفر و بێ باوەر بوون ..؟!

لە (ابو هريره ) — خوا لێ ڕازی بێت — دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((تَجِدُونَ مِن شَرِّ النَّاسِ ذا الوَجْهَيْنِ، الذى يَأْتى هَؤُلاءِ بوَجْهٍ، وهَؤُلاءِ بوَجْهٍ)) .[٢١]واتە : دەبینن خراپترین کەس دوو ڕووەکانە : ئەوانەی دەچنە لای ئەم کۆمەلە بەڕوویەکەوە و دەچنە لای کۆمەلێکی تر بە ڕوویەکی ترەوە ..؟!

---

[٢١]-صحيح مسلم برقم (٢٥٢٦).

سێ یەم : ڕاستگۆیی لە گوفتاردا :

بەڵێ ڕاستگۆیی لە گوفتارو قسەکردندا پێویستە موسلمان زمانی خۆی تێدا بپارێزی ، موسلمان دەبێت تەنها بەراستی قسە بکات وە تەنها دەربرین قسەکانی ووتەی ڕاست و حەق بێت ، وە باشترین و چاکترین گوفتارو قسە ئەوەیە کە بەراستی دەووترێت یان قسەی پێدەکات ، وە سوودە بە گوێگر دەگەیەنی ، وە (خوای گەورە ) نەهی یان قەدەغەی کردووە ، کە ئەو کەسانە گوفتارو قسەکردنیان پێچەوانەی کردارەکانیانن ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣﴾ [الصَّف : ٢ - ٣] واتە:{دەبێت قسەو کردەوە یەك بێت} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢) ] پێش ئەوەی جیهاد پێویست بێت کەسانێك لە باوەڕداران وتیان خۆزگە دەمانزانی خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە چیە تا ئەنجاممان بدایە، خوای گەورە ڕایگەیاند خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە ئیمان هێنان و جیهاد کردنە، دواتر لەسەر کەسانێك لە باوەڕداران قورس بوو، یان لە غەزای ئوحود تێکشکان خوای گەورە فەرمووی: ئەی باوەڕداران بۆچی قسەیەك ئەکەن کە بە کردەوە جێبەجێی ناکەن و نایسەلمێنن، یاخود وتراوە لەسەر مونافیقان دابەزیوە کە وتیان: کوشتارمان کردو نەیانکرد بوو، وە بەڵێنیان بە موسڵمانان دابوو سەریانبخەن و سەریاننەخستن، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پێویست بوونی جێبەجێکردنی بەڵێن)..؟! [ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ (٣) ] خوای گەورە تووڕەبوون و ڕق لێبوونێکی زۆر ڕقی لەو کەسانەیە کە تەنها قسە ئەکەن و بە کردەوە نایسەلمێنن، یاخود شتێکیان نەکردووە ئەڵێن: کردوومانە..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) فەرمانی بە بەندەکانی کردووە ، کە تەقوای خوا بکەن و ووتەو قسەی ڕاست و دروست بلێن ، کە بە پێ شەریعەت وئایینی ئیسلام و دادگەری بێت ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَلۡيَتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡيَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدًا ٩﴾ [النِّسَاء : ٩] واتە : وە با تەقوای خوای گەورە بکەن و قسەی ڕاست و دروست بکەن ئەوەی کە موافقی حەق و دادپەروەری بێ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠﴾ [الۡأَحۡزَاب : ٧٠] واتە : ئەی باوەڕداران تەقوای خوای گەورە بکەن وە وتەیەکی ڕاست و دروست بڵێن کە بە گوێرەی شەریعەت بێ، کە بریتیە لە لا إله إلا الله، یان ڕاستگۆیی..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) نەهی یان قەدەغەی کردووە ، لە شوێنکەوتن بە دوای اسرار یان نهێنی خەلکی دا لە پشتیانەوە هەوالیان بزانن پاشان بە نێو خەلکی دا بلاوبکرێتەوە ، هەروەها قەدەغەی کردووە لە بەندەکانی کە زانیاری نەبوو لە شتێکدا قسەی تێدا بکات ، بە تایبەتی لە شەریعەت و ئاییندا ، هەوالی بە هیچ نەبێت شایەتی بدات بە ناحەق نارەوا ، چونکە بەراستی بیست و بینین و دلی مرۆڤەکان هەر هەمووی ئەمانە لە ڕۆژی قیامەت (خوای گەورە) پرسیاریان لێ دەکات و دەیان هێنێتە قسە کردن ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾ [الإِسۡرَاء : ٣٦] واتە: [ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ] وە لە شتێکیشدا کە زانیاریت نەبوو قسەی تیا مەکە بەتایبەتی لە دیندا، یاخود شایەتی ناحەق مەدە [ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ] بەراستی بیستن و بینین و دڵی مرۆڤ هەر هەموو ئەمانە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە پرسیاریان لێ ئەکات و ئەیانهێنێتە قسە..؟!

بەڵێ (شهاده الزور) واتە:شایەتی دانی بە درۆ یان بە ناحەق و نارەوا نادروست و ناراست ، یەکێکە لە هەر تاوان و گوناهە گەورەکان ،وەك ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆمان باسی کردووە ..؟!

لە (ابو بكر نفيع بن الحارث)– خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بأكبرِ الكبائِرِ ؟ قالوا : بلَى يا رسولَ اللهِ، قالَ : الإشراكُ باللهِ وعقوقِ الوالدينِ، وشهادَةِ الزورِ – أوْ قَوْلِ الزُّورِ -. قال : فما زال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يقولُها، حتى قُلْنَا : ليتَهُ سكَتَ )) .[٢٢] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا گەورەترینی تاوانەکانتان پێ ڕانەگەیەنم ..؟! ووتیان : بەڵێ . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش فەرمووی : هاوبەش بۆ خوا دانان ، ئازاردانی دایك وباوك ، شایەتی دانی بە درۆ ، دەڵێت: ئەوەندە دووبارەی کردەوە هەتا ووتمان : خۆزگە بێدەنگ دەبوو ئەوەندە ئەزیەتی خۆی نەدەدا.

بەڵێ بەدڵنیایەوە لە سەر موسلمان پێویستە لە گەیاندنی هەواڵ هەواڵی ڕاست و دروست بگەیەنی بەخەڵکی ، چونکە پێویستە هەواڵ دەرکە خۆی لە هەواڵی ناردوست و گوماناوی درۆ و وەهم بەدوور بگرێت ، چونکە دورست نیە مامەڵە یان گرینگی بە هەواڵی نادروست و درۆ بدرێت ، لە ناو کۆمەڵگای موسلمانانەدا ، لە ترسی ئەوەی ئەم هەواڵە نارستە دەبێتە سەرهەڵدانی فیتنە ئاشووب دووبەرەکی لە نێو موسلمانانەدا ، ئەگەر سەرنجێك بخەینە ئەم سەردەمی ئێستای تەکنەلۆجیا کە پێشکەوتووە تۆرە کۆمەلایەتیەکان زۆر بوونە ، ڕۆژانە بە هەزاران هەواڵی درۆ دەخرێتە نێو تۆرەکۆمەلایەتیەکان ، بێ ئەوەی هەواڵە کە پشت ڕاست بکرێتەوە خەڵکی لە خۆیانەو بڵاوی دەکەنەوە ، ئەمەش دەبێتە فیتنە تاوان و ئاشووب لە نێو کومەڵگادا ، یان بە هەزاران وعدو بەڵێن دۆر دەدرێت و بڵاو دەکرێتەوە بە ئاشکرا لە نێو خەڵکی دا ، کەچی دوا تر ناراست و بێ بەڵێن و بێ پەیمان و بێ وعد دەردەچێت ، ئەمانە هەر هەمووی تاوانی گەورەن ئەمە پێشەی مونافق دوو ڕووەکانە هەمیشە لە قسە کردنەکانیان درۆ دەکەن وعدو پەیمان بەڵێن و ئەمانەت ئەو سپاردەو بەرپرسیاریانەی کە لە سەر یانە بەجێ نا هێنن ، بۆیە دەبێتە دیاردەیەکی زۆر ناشرین لە نێو خەڵکی دا ، چونکە تاك کۆمەڵگا بەم درۆ کردن ناراستیە خراپەکاری ڕوودەدا.

---

[٢٢]-السنن الترمذي برقم (٢٣٠١).

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦﴾ [الحُجُرَات : ٦] واته: {دڵنیا بوون له هەواڵ} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ (٦) ] ئەی باوەڕداران ئەگەر کەسێکی فاسق و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە هەواڵێکی بۆ هێنان ئێوە تەبەیون و تەثبوت بکەن و پەلە مەکەن لە بڕیارداندا تا دڵنیابن کە ئەو هەواڵە ڕاستە چونکە دواتر لەوانەیە کەسانێك بە نەزانی تووشی زەرەرو زیان بکەن وە هەڵەتان لێ ڕوودات وە دواتریش پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردووتانە، کە وتراوە: لەسەر (وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط) دابەزیوە کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناردوویەتی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی (بەنی موستەلیق)..؟!

بەلێ ئەگەر موسلمان شتێگ یان هەوالێك بگێرێتەوە ، تەنها ئەو هەواله دەگێرێتەوە کە راست و دروست بێت لە گەل واقع دا بگونجێت ، ئەگینا دەبێتە درۆزن ، هەر وەك نیشانەکانی دوو رووی سیانە کە لەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مان نیشانەکانی دوو روو دەخاتە روو ..؟!

لە ( ابو هريره ) — خوا لێ رازی بێت — دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ )) .[٢٣] واتە : نیشانەی مونافیق یان دوو روو سیانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات ..؟! ئەگەر وعد یان بەلێنی دا جێ بەجێ نەکات یان نەیباتە سەر ..؟! ئەگەر ئەمانەت یان سپاردەیەکی لادانرا ئەوا خیانەتی یان ناپاکی لێدەکات ..؟!

---

[٢٣] -صحيح مسلم برقم (٥٩).

## دەربارەی درۆ کردن

بەلێ سەبارەت بە درۆ کردن بێ گومان گوفتارێکی قەدەغە و حەرام کراوە لە سەر هەموو موسلمانێك ، چونکە لە ناشرینی تاوان و گوناهەکانە ، لەبەر ئەوەی وێنەیەکی زۆر قێزەون ناشرین لە نێو کۆمەڵگای موسلماناندا ، ئەو کەسەی کە دۆر بکات بە ناوی (خوای گەورە ) یان بەناوی پێغەمبەرەکەی ﷺ ، چونکە دۆر کردنە بەناوی ئایینی (خوای گەورە ) وە ، هەڵبەتە هەر وەك زانراوە سیفەتی پێغەمبەران – علیهم الصلات – سیفەتی ڕاستگۆییە ، بۆ گەیاندی تبیلغ و رسالە پەیامی (خوای گەورە ) گەیاندنی بە هەواڵی ڕاست و دروست بە نێو خەلکی دا ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٤٤﴾ [الأَنْعَام : ١٤٤] واتە: [ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] کێ زاڵمترە واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە زاڵمترو ستەمکارتر نیە کە درۆ هەڵئەبەستێ بۆ خوای گەورەو بەناو خوای گەورەوە قسە دەکات و شت حەڵاڵ و حەرام ئەکات [ لِيُضِلَّ النَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ] تا خەڵکی گومڕا بکات بەبێ زانیاری [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ] بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێکی ستەمکار نادات کە بەناو خوای گەورەوە قسە بکەن و خۆیان شت بۆ خەڵك حەڵاڵ بکەن و حەرام بکەن..؟!

هەر وەکو ئەم فەرموودەیەی دەربارەی درۆکردنی بەمتعمد یان بەئەنقەست جێگای دۆزەخە .؟!

لە (الزبير کوری العوام ) – خوا لێ رازی بێت– دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((من كذبَ عليَّ متعمِّدًا فليتبوَّأ مقعدَهُ منَ النَّارِ)) .[٢٤] واتە : هەر کەسێ بە متعمد یان ئەنقەست درۆ بە ناوی منەوە بکات با جێگەی لە ئاگری دۆزەخەوە بۆ خۆی دابنێ ..؟!

لە(أنس کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((من كذبَ عليَّ حسبتُ أنَّهُ قالَ : متعمِّدًا فليتبوَّأ بيتَهُ منَ النَّارِ)) .[٢٥] واتە : هەر کەس بەناوی منەوە درۆ بکات ، وبزانم فەرمووی : بە متعمد یان بە ئەنقەست ئەوا با ماڵێ لە دۆزەخ بۆ خۆی دابنێ ..؟!

---

[٢٤]-سنن ابو داود برقم (٣٦٥١).
[٢٥]-سنن الترمذي برقم (٢٦٦١).

بەڵێ لە بنچینەدا درۆ کردن ڕێگە پێدراوە نیە و حەرام کراوە لە سەر هەموو موسلمانێك ، بەلام لە هەندێك بارو دۆخدا شەریعەتی ئیسلام ڕێگەی پێداوە ، ئەویش بە مەرجێك کە بەرژەوەندیەکی زۆر گەورە بێت بۆ دوو خستەوە لە زیان گەیاند بێت لە بەرژەوەندی گشتی و چاکە کردن یان ئەصلاح کردنی نێوان دوو برا بێت ، یەکێك لەو حالەتانە ئەوەیە کە کەسێك ناوبژیوان یان ئەصلاح ئاشتەوایی نێوانی دوو کەس یان دوو کۆمەل بکات، ، بەمەرجێ دادپەروەری لە نێوانیاندا ئەنجام بدات ئەگەر بەشێکی ئاشتەوایەکەش بێت ، یان درۆکردن لە جەنگدا ، یان پیاوێك درۆ بکات بۆ ڕەزامەندی هاوسەرەکەی ، هەر وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ..؟!

لە ( أسماء بنت يزيد أم سلمة الأنصارية ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لَا يحلُّ الْكذبُ إلَّا فى ثلاثٍ يحدِّثُ الرَّجلُ امرأتَهُ ليرضيَها والْكذبُ فى الحربِ والْكذبُ ليصلحَ بينَ النَّاسِ )) .[٢٦] واتە : درۆ کردن حەق نیە یان ڕەوا نیە لەم سێ حالەتەدا نەبێ : پیاوێك درۆ بکات بۆ ڕەزامەندی هاوسەرەکەی ، درۆ کردن لە جەنگدا ، درۆکردن بۆ ئاشتەوایی لە نێوان خەلیکدا ..؟!

لە (أم كلثوم بنت عقبة ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ليسَ بالْكاذبِ من أصلحَ بينَ النَّاسِ فقالَ خيرًا أو نمى خيرًا)) .[٢٧] واتە: ئەو کەسە بە درۆزن داناندرێت یان لە قەلەم نادرێت ، کە ئاشتەوایی و چاکسازی بکات لە نێوان خەلکدا قسەی بکات بۆ مەبەستی خێرو چاکە و ئاشتەوایی یان قسەی چاك بهێنێ و ببات ..؟!

[٢٦] -سنن الترمذي برقم (١٩٣٩).
[٢٧] - الترمذي برقم (١٩٣٨).

چوارەم : راستگۆیی لە کارو کردار دا :

**بەڵێ راستگۆیی لە کارو کردار دا وە پابەند بوون پێیەوە ، لە هەر رەوشتە بەرزەکانی ئیمانداران و راستگۆیان و پێغەمبەرانە – علیهم السلام – هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ٢٣﴾ [الأحزَاب : ٢٣] واته: واته: [ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ] (ئەنەسی کوڕی مالیك) دەفەرمێت: (ئەنەسی کوڕی نەزری) مامم لە غەزای (بەدر) بەشداری نەکرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئامادەی یەکەم غەزا نەبووم کە کوشتاری کافرانت کرد ئەگەر خوای گەورە یارمەتیم بدات ئامادە بم لە کوشتاری کافران دەمبینێت کە چی دەکەم، لە غەزای (ئوحود)دا کە موسڵمانان تێکشکان، وتی: خوایە من داوای لێبوردنت لێدەکەم کە هاوڕێکانم تێکشکان، وە بەریم لەوەی کە کافران دەیکەن، پاشان چووە پێشەوە (سەعدی کوڕی موعاز) پێی گەیشت، وتی: ئەی (سەعدی کوڕی موعاز) سوێند بێت بە خوای باوکم من بۆنی بەهەشت دەکەم لە لای (ئوحود)هوە، (سەعد) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەوەی (ئەنەسی کوڕی نەزر) کردی من نەمتوانی بیکەم، (ئەنەس) دەفەرمێت: بینیمان هەشتاو ئەوەندە برین بە لەشیەوەیە کە بە شمشێرو رم و تیر لێیدرابوو، وە کوژرا بوو وە لاشەی شێوێنرابوو کەس نەیناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت بە سەرەپەنجەکانی ناسیەوە، (ئەنەس) دەفەرمێت: ئەم ئایەتە لەسەر (ئەنەسی کوڕی نەضر)و هاوشێوەکانی دابەزیوە: لەناو پیاواندا کەسانێك هەن کە ڕاستگۆ بوونە لەو بەڵێنەی کە بە خوای گەورەیان داوە کە بەرگری لە دینی خوای گەورە بکەن [ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ ] جا هەیانبووە بەڵێنەکەی جێبەجێ کردووە کە بەڵێنیان داوە کە بگەن بە دوژمن کوشتاریان بکەن، یاخود مردوونەو شەهید بوونە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: (طلحة لەم کەسانەیە) [ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ ] وە هەشیانە چاوەڕێیە کە ئەجەلی بێت و لە پێناو خوای گەورە بکوژرێ [ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ]..؟!

بەڵێ نموونەیەکی زۆر باش نایاب وەکو پێغەمبەری خوا (شعیب ) – علیه السلام – هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨﴾ [هُود : ٨٨] واتە: [ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي ] شوعەیب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: ئەی قەومی خۆم هەواڵم پێ بدەن کە من لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام لەلایەن خوای گەورەوە [ وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ] وە ڕزق و ڕۆزی و ماڵێکی زۆرو باش و حەڵاڵی پێ بەخشیووم، یان پێغەمبەرایەت و حیکمەتی پێ بەخشیووم [ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ] وە من نامەوێ پێچەوانەی ئێوە بکەم و شتێك لە ئێوە قەدەغە بکەم و خۆم بیکەم [ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ ] بەڵکو من تەنها مەبەستم چاکسازیەو چاکسازیم دەوێت چەندێك لە توانامدا بێت [ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ ] وە ڕێنمایی و هیدایەتی من تەنها لەلایەن خوای گەورەوەیە [ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ] کارەکانم هەمووی بەو سپاردووەو تەوەکولم لەسەر ئەوە، وە هەر بۆ لای خوای گەورەش ئەگەڕێمەوە..؟!

یان ئەو کەسانەی فەرمان بە خەلکی دەکەن بە چاکە ، بە خۆشیان جێ بەجێ ناکەن خۆیان لێ دەدزنەوە لە ژوورە تاریکەکان کارو کردەوەی خراپە ئەنجام دەدەن ، کەچی فەرمان لە سەر خەلکی دەکەن کرداری چاك ئەنجام بدەن بەلام ئەوان دوو روون لە کارو کردەوە کانیان دا هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿۞ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٤٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤٤] واتە: ئایا ئێوە فەرمان ئەکەن بە خەڵکی بە چاکە و ئیمان هێنان و نوێژو ڕۆژوو وە خۆتان لەبیر ئەکەن و خۆتان نایکەن لە کاتێکدا ئێوە کتاب ئەخوێننەوەو لە کتابەکەدا ئەو شتانەی تیایە ئەی بۆ عاقڵ نابن و تێناگەن..؟!

بەڵێ ڕاستگۆیی لە هەر کردارێك ئەوەیە کە موسلمان پێی هەڵدەستێت کە بەرێك و پێکی ئەنجامی بدات بە بێ هیچ کەم و کوریەك کردارەکەی ئەنجامدەدات ئەوەی فەرمانی پێکراوە ،وە ئەنجامدانی هەر کارێك یان کردارێك مافی خاوەنەکەی دەگەڕێنێتەوە بە تەواوەتی و بەرێك و پێکی ، هەڵبەتە نابێت موسلمان خش و چەواشەکاری فرتوو فێل درۆ و ستەم لە کارەکەیدا بکات ، چونکە هەر کارێك کە ئەنجامی بدەی دەبێت یەکەم شت حەلالی بکەی و نەفسی خۆت تێدا ئاسوودە بکەیت ، وە نابێت هیچ خش خداع و فێل و ستەم بکەێت ، چونکە دەبێتە دزی و درۆ و ئەمانەت یان نا بەرپرسیارەتی و ئەمانەن نە پاراستن و خیانەت ناپاکی لە کارەکەدا یان لە کردارەکەدا ، بەڵکو دەبێت بەو پەری دلسۆزیەوە کارەکە ئەنجام بدەیت ، بۆ ئەوەی خێرو برەکەت نیعمەت و رزق برژێت بەسەر تا ، ئەوەی کارێك ئەنجام بدات بە دلسۆزیەوە بێ گومان (خوای گەورە ) کار ئاسانی و کارەکەی سهل دەکات ، هەموو شتێکی بۆ فەراهەم دەکات ، بێ گومان ئەوەی لە غەزای بەدر دا ڕوویدا ، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ لەگەل هاوەلەکانی بۆ ئەم کارە یان ئەم جەنگە دژی موشریکان یان کافرانی قورەیش ئەنجامیاندا بەو پەری دلسۆزیەوە بوو ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) جەنگە کەی بۆ ئاسان کردن بە سەری خستن بە سەر دوژمنەکانیان ، هەروەها جندی خۆی رەوانە کرد هاوکاری کۆمەکی موسلمانان بوون ئەویش فریشتەکانی خۆی بوو کەرەوانەی کرد ، بۆیە دلسۆزی لە پێناوی (خوای گەورە ) بۆ هەر کارێك دەرئەنجامی سەرکەوتن و سەفرازیە.

لە (عائشة ام المؤمنين) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ يحِبُّ إذا عمِلَ أحدُكم عملاً أنْ يُتقِنَه)) .[٢٨] واتە: (خوای گەورە ) ئەو کەسەی زۆر خۆش دەوێت کە کەسێك لە ئێوا کارێك دەکات بە باشی و بە رێك و پێکی ئەنجامی دەدات..؟!

بەڵێ بێگومان لە هەر کارێك یان بازرگانیەکدا ئەگەر ڕاستگۆ نەبیت هیچ سەرمایەکت تێدا دەست ناکەوێت ، بەلام ئەگەر ڕاستگۆی بێت ئەوا قازانجێکی زۆر و بەرهەمێکی زۆری دەبێت ، چونکە هیچ بازرگانی مامەلەیەك و کارێك دورست نیە لەسەر بنچینەی درۆ کردن فروفێك خش کردن ، بەلکو ئەم بازرگانیە مامەلەکردنە یان ئەم کارە باتل پووچەل حەرام دەبێت بۆ خاوەنەکەی ،یان کرێکارێك خش فێل لە کارەکەی بکات یان فەرمانبەرێك خش فروفێل لە کارەکەی بکات ، بێ گومان ئەو پارەیەی کە وەری دەگرێت حەرامە یان ئەو مامەلەی کەدەکان حەرامە ...

---

[٢٨]-البوصيري في إتحاف الخير المهرة (٣/٣٨٢).



بێ گومان ڕاستگۆیی لە کردار پێویستە موسلمان گوێڕایەلی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) بێت ، وە فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات و خۆی دووربکەوێتەوە لە قەدغەکراوەکانی ، لەو قەدەغەکراوانەی کە خراپن و زیانی پێدەگەیەنن ، هەروەها موسلمان دەبێت پابەندی ئەو ڕێنماییی و هیدایەتەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت ،(محمد الغزالی )دەلێت :" کارێك کە ڕاستگۆیانە ئەنجامی بدەیت ئەوا هیچ گومانێکی تێدانیە ، چونکە لە دل دەروونی دا لە دایك بوون دلسۆزیی یەقینی لە گەل دایە ، وە هیچ ئارەزوو هەواو بازیەکی لە گەل دانیە " چونکە ئیخلاص و دلسۆزی زۆری لە گەل دایە ، هیچ خوارو خێچ و خراپەکاریەکی لە دانیە " چونکە ئەم کارە لە ڕاستی حەق و ڕەواوە سەرچاوەی گرتووە " .[٢٩]

بەلێ پێویستە لە سەر گوفتارو کردارمان ڕاستگۆبین " چونکە دەحەسێنەوە و ڕزگارمان دەبێت، لە هەموو نەهامەتی نارەحەتییەك کە تووشمان دەبێت " بێ گومان ئەم باسەی ڕاستگۆیی زۆر فرەوانە ، چونکە پەیوەندی بە هەموو ئەو مامەلەو بازرگانی پەیوەندیەکانی خەلك و کار کردنی ڕۆژانەی خەلك بازار ژیانی کرێکاری ، وە ژیانی فەرمانبەران لە دامودەزگاکانی دەولەت هەموو چین توێژەکانی نێو خەلکی ئەو پەیوەندیانەی کە دروستیان کردووە ، وە پێویستە لە سەر بنچینەی ڕاستگۆیی بێت ، بۆ نموونە لە هەر مالێك دا درۆ کردن ببێتە پیشەیان یان لە هەر کۆمەلگایەك یان لە کارێك ئەوا ئەو شوێنە دەبێتە مالی جالجالۆکە ، کە (خوای گەورە ) بۆ مان باسی مالی جالجالۆکە دەکات " دەفەرمووێت :قال تعالی: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٤١﴾ [العَنكَبُوت : ٤١] واتە: نمونەی ئەو کەسانەی کە جگە لە خوای گەورە دەپەرستن} [ مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ ] نموونەی ئەو کەسانەی کە جگە لە خوای گەورە ئەپەرستن وەکو نموونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە [ اتَّخَذَتْ بَيْتًا ] کە خانوویەکی بۆ خۆی دروست کردووە [ وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ] بەدڵنیایی لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر بزانن، (ئەوانەیشی کە عیبادەت بۆ جگە لە خوای گەورە ئەکەن عیبادەتەکەیان ئاوا پووچەڵ و بێ بنەمایەو خواکانیان وەکو جاڵجاڵۆکە لاوازو بێدەسەڵاتە، بە پێچەوانەی موسڵمانەوە کە خوای باڵادەستی بەدەسەڵاتی خاوەنی ئەم بوونەوەرە گەورەیە دەپەرستێت)..؟!

[٢٩]-خلق مسلم ، محمد الغزالي ص٤٥.

لە (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : ((أنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ مَرَّ علَى صُبْرَةِ طَعامٍ فأدْخَلَ يَدَهُ فيها، فَنالَتْ أصابِعُهُ بَلَلاً فقالَ: ما هذا يا صاحِبَ الطَّعامِ؟ قالَ أصابَتْهُ السَّماءُ يا رَسولَ اللهِ، قالَ: أفَلا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعامِ كَىْ يَراهُ النَّاسُ، مَن غَشَّ فليسَ مِنّى )) .[30] واتە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ڕۆیشت بەلای کۆمەڵێك خواردەمەنیدا دەستی تێخست و پنچەکانی تەر بوون ، فەرمووی : (ئەمە چیە ئەی خاوەنی خۆراك ..؟!) ئەویش ووتی : باران لێداوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ " پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی نە دەبوو تەرەکەت بخستایە سەرەوە تاکو خەلك بیبینێت ..؟!پاشان فەرمووی : هەر کەسێك غش یان فرو فێڵ بکات لە ئێمە نیە ..؟!

لە (أنس کوری مالك) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێڕنەوە ، کە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : ((يا بُنيَّ إن قدرتَ أن تُصبحَ وتُمسىَ ليسَ فى قلبِكَ غشٌّ لأحدٍ فافعل ثمَّ قالَ لى يا بنىَّ وذلِكَ من سُنَّتى ومن أحيا سُنَّتى فقد أَحيانى ومَن أَحيانى ( وفى روايةٍ فقد أحبَّنى ومن أَحبَّنى كانَ معى فى الجنَّةِ )) .[31] واتە: کوری خۆم ئەگەر دەتوانی بەیانی ئێوارە بە سەر بەری دلت غەل و غەشی یان فرو فێڵی تێدان نەبێ بەرانبەر بە هیچ کەسێ ئەوە ئەو کارە بکە " پێی فەرمووم : هەر کەسێ سوننەتێکی من زیندووبکاتەوە ئەوە منی زیندوو کردۆتەوە ، هەر کەس من زیندووبکاتەوە ئەوا لەگەل منە لە بەهەشتدا ..؟!

---

[30]-صحيح مسلم برقم (١٠٢).
[31]-سنن الترمذي برقم (٢٦٧٨).

پێنچەم : ڕاستگۆیی لە وعد و بەڵێن و پەیماندا :

**بەڵێ ڕاستگۆیی لە وعد و بەڵێن و پەیماندا یەکێك لەو ڕەوشتە بەرزانەی کە موسلمانان یان ئیمانداران پێوەی پابەندن لە وعد و بەڵێنەکانیاندا ..؟!**

**(خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واتە : [ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ] وە نوێژەکانی بکات و زەکاتی ماڵەکەی بدات، وە ئەوانەی وەفایان هەیە بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بەخوای گەورەو بەخەڵکیان داوە [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وە ئەوانەی کە ئارامگرن لەکاتی سەغڵەتی و هەژاری و نەخۆشیدا، وە لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئەمانە ڕاستگۆن لە ئیمانەکەیاندا، وە ئەمانە تەقوای خوای گەورەیان کردووەو موتتەقین نەك جولەکەو گاور..؟!

**هەروەها هەموو مرۆڤێك لە ڕۆژی دوایی دا پرسیاری دەربارەی عهد بەلێنی لێ دەکرێت ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ٣٤﴾ [الإِسْرَاء : ٣٤] واتە : [ وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ ] وە کە پەیمانێکتان هەبوو بیبەنە سەرو وەفاتان بەرامبەری هەبێت و بیپارێزن [ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا ] لەبەر ئەوەی بەدڵنیایی مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر پەیمانەکانی پرسیاری لێ ئەکرێ..؟!

**وە وصیەتی (خوای گەورە ) بۆ موسلمانان بە وەفاداری بە وعد بەلێنەکانیان ، هەروەك دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ١٥٢﴾ [الأَنْعَام : ١٥٢] واتە: [ وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ] وە وەفاتان هەبێ بەرامبەر ئەو بەڵێنانەی کە بەخوای گەورەتان داوە، یان ئەم وەسێت و ئامۆژگاریانەی خوای گەورە جێبەجێ بکەن، وەفاداریش ئەوەیە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن و کار بە قورئان و سوننەت بکەن [ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ] بەم شێوازە خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات و ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو ئێوە بیر بکەنەوە..؟!

هەروەها وەسف کردنی (خوای گەورە ) بە وعد و بەلێنی وەفاداری لە باشترین سیفاتەکانە ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واته : [ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ] وە نوێژەکانی بکات و زەکاتی ماڵەکەی بدات، وە ئەوانەی وەفایان هەیە بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بەخوای گەورەو بەخەڵکیان داوە [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وە ئەوانەی کە ئارامگرن لەکاتی سەغڵەتی و هەژاری و نەخۆشیدا، وە لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئەمانە ڕاستگۆن لە ئیمانەکەیاندا، وە ئەمانە تەقوای خوای گەورەیان کردووەو موتتەقین نەك جولەکەو گاور..؟!

هەروەها ئەوەی وەفادار بێت بەرانبەر بە وعد و بەلێنەکانی ، ئەوا خۆشەویستی (خوای گەورە ) بەدەست هێناوە ، وە لە لای خەلکیش خۆشەویست دەبێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت: قال تعالى: ﴿بَلَىٰۚ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧٦﴾ [آل عِمۡرَان : ٧٦] واته : [ بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى ] بەڵێ هەر کەسێك وەفای هەبێ بەرامبەر بە عەهدو پەیمانی و ماڵی خەڵکی بگەڕێنێتەوە، یان وەفای هەبێت بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بە خوای گەورەی داوە کە ئیمان بە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بێنن، وە تەقوای خوای گەورە بکات و ماڵی خەڵکی بەناحەق نەخوات و ئەمانەتی خەڵکی بگەڕێنێتەوە [ فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ] ئەوە هەر کەسێك بەو شێوازە تەقوای خوای گەورە بکات بەدڵنیایی خوای گەورە خۆشی ئەوێ ..؟!

بەلێ (خوای گەورە ) هۆشداری یان ئاگاداری ئیمانداران دەکاتەوە ، ئەو کەسانەی کە وعد و پەیمان و بەلێنەکانیان دەشکێن و نابەنەسەر ، پەیشمان دەبەنەوە لەو وعد و پەیمانەی کە داوەتیان ، بێ گومان ئەم وعد و بەلێن شکاندنە بە قێزەون ترین و خراپترین کردەوە دادەنرێت ، هەروەك دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ [البَقَرَة : ٢٧] واتە: [ الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ ] ئەو کەسانەی کە عەهدو پەیمانی خوای گەورە هە لئەوەشێننەوە لە دوای ئەوەی کە عەهدو پەیمانیان داوەو خۆیان پێوە پەیوەست کردووە [ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ ] وە ئەو پەیوەندی خزمایەتیەی کە خوای گەورە ئەمری کردووە بیگەیەنن ئەوان ئەیپچڕێنن [ وَيُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ ] وە ئاشووب ئەنێنەوە لەسەر زەوی بە خراپەکاری [ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] ئا ئەمانە زەرەرمەندن لە دونیاو لە قیامەتدا..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ٧٧﴾ [التَّوْبَة : ٧٧] واتە: [ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ ] لەسەر مونافیقان دابەزیوە ئەوان بوونە کە بەهۆی نەبەخشین و ڕەزیلیان و بەڵێن نەبردنە سەریان لەگەڵ خوای گەورە خوای گەورە زیاتر تووشی نیفاق کردن و نیفاق خستە دڵیانەوە تا ڕۆژی قیامەت کە ئەگەن بە خوای گەورە [ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ ] بەهۆی ئەو وەعدانەی کە لەگەڵ خوای گەورە نەیانبردە سەر [ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ] وە بەهۆی ئەوەی کە درۆیان ئەکرد..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾

[المَائِدَة : ١]واتە: ئەی باوەڕداران وەفاتان هەبێت بەرامبەر ئەو عەقدو بەڵێننامەو پەیمانانەی کە داوتانە بە خوای گەورە وە لە نێوان یەکتریشدا بەیەکتریتان داوە جێبەجێی بکەن و بیبەنە سەر، یاخود ئەوەی کە خوای گەورە لە قورئاندا حەڵاڵی کردووەو حەرامی کردووەو فەرزی کردووەو دیاری کردووە ئێوە هەڵیمەوەشێننەوە.؟!

## کاریگەریەکان و بەرهەمەکانی راستگۆیی

بەڵێ راستگۆیی رەوشتێکە لە رەوشتە پێویستیەکانی گومەڵگای موسلمانان ، وە یەکێکە لە رەوشتە بەرزەکانی سلوك و رفتاری مرۆڤ ، وە سوودێکی یەکجار زۆری هەیە بۆ کومەڵگایی مرۆڤایەتیدا ، چونکە دەبێتە هۆکاری بنیات نانی بناغەی شارستانیەتی کۆمەلایەتی چاکسازی ، وە هەموو رەوشتە بەرزەکانی تری مرۆڤ بەدوایی دا دێت ، ئەمەش دیارە ئایینی ئیسلام فەرمان بە شوێنکەوتەکانی دەکات ، کە رێگای راستگۆیی بگرنە بەر ، چونکە تێدا سەرکەوتو سەفەرازی.

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ۝١١٩﴾ [التَّوْبَة : ١١٩] واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن [ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ] وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن، واتە لەگەڵ پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - هاوەڵان بن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۝٢١﴾ [مُحَمَّد : ٢١] واتە: [ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَعْرُوفٌ ] ئەگەر گوێڕایەڵی خوای گەورەیان بکردایە وە وتەی باشیان بوتایە ئەمە باشتر بوو بۆیان [ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ ] وە کاتێك کە کارەکە جدی بوو، وە کوشتاری کافران دەستیپێکرد [ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ ] ئەگەر لەگەڵ خوای گەورە ڕاستیان بکردایەو ئیمانیان بهێنایەو گوێڕایەڵی خوای گەورەیان بکردایە ئەوە بۆیان باشتر بوو لەوەی کە سەرپێچی خوای گەورە بکەن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ۝٣٣﴾ [الزُّمَر : ٣٣] واتە: [ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ ] وە ئەو کەسەی کە ڕاستی و تەوحیدو یەکخواپەرستی هێناوە کە پێغەمبەری خوایە -صلى الله عليه وسلم - ، یان جبریلە، یان سەرجەم پێغەمبەرانە [ وَصَدَّقَ بِهِ ] وە ئەوانەیشی کە بەڕاستیان داناوە، واتە: باوەڕداران، یان وتراوە: مەبەست پێی (ئەبوبەکری صدیق)ە (خوای لێ رازی بێت) کە یەکەم کەس بوو ئیمانی هێناوە [ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ] ئا ئەمانە بەڕاستی کەسانێکی موتتەقی و لە خواترس و خۆپارێزن..؟!



یەکەم : کاریگەری و بەرهەمی راستگۆیی لە ژیانی دونیادا :

١-راستگۆیی بەلگەیە لەسەر ئیمان و تەقواداری بەندە :

وەکو باسمان کرد یەکێك لە سیفەتە هەر باش و گەورە رەوشتە بەرزەکانی مرۆڤ راستگۆیی ، بێ گومان راستگۆیش بنچینەو بناغەی بە هێزی لە ئیمان و تەقوادری مرۆڤی ئیماندارەوەیە ، چونکە (خوای گەورە) فەرمان بە بەندەچاکە کان دەکات وە ستایشیان دەکان بە کرداری باش و چاکە ئەویش وەك ئیمان و تەقواوداری یان خۆپارێزی و راستگۆیی و صەبر ئارام گرتن ، هەر وەك لە ئایەتەدا (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿۞ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واتە: {شێوازی چاکە کردن } [ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ] چاکە تەنها ئەوە نیە کە ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، دیسان ڕەددە بۆ جوولەکەو گاورەکان کە زۆر قسەیان کرد سەبارەت بەگۆڕینی قیبلە [ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ] بەڵکو چاکە ئەوە یە کە هەر کەسێك ئیمان بێنێ بەخوای گەورەو بەڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبە ئاسمانیەکان و بە سەرجەم پێغەمبەرانی خوای گەورە [ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ ] وە لە کاتێکدا کە ماڵەکەی لەلا خۆشەویست و شیرینە ببەخشێ و ببدات بە خزمی نزیکی خۆی و بە بێباوکان و هەژاران و ڕێبواران و ئەوانەی کە لە ناچاریدا داوا ئەکەن و پێویستیانە و ئەوانەی کە کۆیلەن بەو پارەیە خۆیانی پێ ئازاد ئەکەن [ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ] وە نوێژەکانی بکات و زەکاتی ماڵەکەی بدات، وە ئەوانەی وەفایان هەیە بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بەخوای گەورەو بەخەڵکیان داوە [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وە ئەوانەی کە ئارامگرن لەکاتی سەغڵەتی و هەژاری و نەخۆشیدا، وە لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ] ئا ئەمانە ڕاستگۆن لە ئیمانەکەیاندا، وە ئەمانە تەقوای خوای گەورەیان کردووەو موتتەقین نەك جولەکەو گاور..؟!

٢-راستگۆیی بەڵگەیە لە سەر خۆ بەری کردن یان البراءت لە نیفاق یان دوو روویی :

بەڵێ (خوای گەورە ) خەلکی دابەش کردووە بە سەر دوو چین ، ئەویش راستگۆیان ئەوانەی لەگەل (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی و خەلکی راستگۆن ، چینی دووەمیش ئەوانەن کە (کذاب و منافق) واتە: دوو روو و درۆزن و خیانەتکارو ناپاکن " هەروەکو باسمان کرد ئیمان و درۆکرن یان دوو رووی نیفاق کردن بەیەکەوە کۆنابنەوە ، تەنها دەبێت یەکەکیان لە ناخی دا دەربچێت ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٢٤﴾﴾ [الْأَحْزَاب : ٢٤] واتە: [ لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ ] تا خوای گەورە پاداشتی ڕاستگۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستگۆییانەوە کە باوەڕدارانن [ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ ] وە سزای مونافیقان بدات ئەوەی کە ویستی لێ بێت و بەردەوام بێت لەسەر نیفاق [ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ] یان لێیان خۆشبێ لەوانەی کە تەوبە دەکەن [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا ] بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییە..؟!

بەڵێ لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ، کە پابەندبوون بە راستگۆیی ئەرکی سەر شانی هەموو ئیماندارێکە لەسەر گۆیی زەمین لە م ژیانەدا ، وە راستگۆیی و لێ وورد بوونەوەی لە هەموو پرسێکی ژیاندا ، وە جەخت کردنە سەری لە هەموو بریارو حوکمێدا لە نێوان خەلکی دا ، چونکە راستگۆیی پێگەو مەنزیلە و پایەی بنەرەتیە لە دروست کردنی رەوشتی موسلمان ، هەلبەتە سیفەتێکی جێگیر لە سلوکی هەموو ئیماندارێك ، بە هەمان شێوە کۆمەلگای ئیسلامی دروست بووە بە جەنگ کردن لەسەر گومانە خراپەکان ..؟!

لە (عبداللە کوری مسعود ) - خوا لێ رازی بێت - دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لا يُبَلِّغني أحَدٌ من أصْحابى عن أحَدٍ شيئًا؛ فإنِّي اُحِبُّ أنْ أخرُجَ إليكم وأنا سَليمُ الصَّدرِ )) .[٣٢] واتە: با هیچ کەسێ لە ئێوە هەوالی یان قسەیەکم بۆ نەهێنێ لە یەکێ لە هاوەلەکانمەوە کە پێم ناخۆش بێ و لێی تۆرە بم ، چونکە من پێم خۆش بە دلێکی ساف و بێگەردەوە بێم بۆ ناوتان ..!! واتە: جاسووسی و سیخوری بە سەر یەکەوە مەکەن ..؟! هەروەها رەتکردنەوەی ئەو دەنگە ناراست و ناشازانە کە دەیانەوێت کۆمەلگای ئیسلامی پەیوەندی کۆمەلایەتی یەکانیان ، بەدرۆکانیان بوەستێنن ، بێ گومان ئەو دەنگۆیانەش لە دوو روو و منافیقە کان کافران وەك یهود ونصرانی و مولحیدەکان و ئەوانەی بانگەشی عەلمانیەت

[٣٢]-سنن ابو داود برقم (٤٨٦٠).

دەکەن ، ئەوانە تانە تەشنە دەنێنەوە لە نێو موسلمانان‌اندا وە خەلکی هاندەدەن بۆ درۆ کردن و بەد رەوەشتی و تێکدانی پەیوەندیەکانی کۆمەلایەتی لە نێو موسلمانان‌اندا ، بەلام موسلمانان بە رەوەشتە بەرزەکانیانەوە بەرنگاریان دەبێتەوە ئەوانەی کە خاوەن ئیمانێکی بەهێزو تەقواداری بەهێزن لە(خوای گەورە ) ترسیان هەیە بۆیە هەمیشە راستگۆن لە گەل نەفسی خۆیان چونکە باوەرداری راستە قینەن ..؟!

لە ( عائشة أم المؤمنين ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی : ((إنَّ المُؤمِنَ ليُدرِكُ بحُسْنِ خُلُقِهِ درجةَ الصَّائمِ القائمِ)).[٣٣] واتە: بەراستی خاوەن باوەر بە هۆی خۆرەشت و ئاکاری جوانەوە پلەو پایەی دەگاتە پلەو پایەی رۆژوەوانی شەو نوێژ کەران ..؟!

لە (أبو الدرداء ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ما مِن شيءٍ أثقلُ في الميزانِ مِن حُسْنِ الخُلُقِ )) .[٣٤] واتە: بەراستی هیچ شتێك لە رەوشت بەرزی و ئاکاری جوان قورستر و گرانتر نیە لە سەر میزان یان تەرازووی کردەوەکان ، –ئەوەندە خێرو پاداشتی زۆر و گەورەیە لە لای (خوای پەروەردگار )..؟!

لە( أنس کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من ترك الكذبَ وهو باطلٌ بُنِيَ له في ربضِ الجنةِ ومن ترك المِراءَ وهو محقٌّ بُنِيَ له في وسطِها ومن حُسْنِ خُلُقِهِ بُنِيَ له في أعلاها )) .[٣٥] واتە: هەر کەس تەرکی درۆ بکات لە کاتێکدا کە درۆکە پرو پووچ و باتلە لە چواردەورەی بەهەشت خانوویەکی بۆ دروست دەکرێت ، هەرکەس تەرکی موجادەلە یان مشتومر بکات لە کاتێکدا کە لە سەر حەق بێ لە ناوەراستی بەهەشتدا خانوویەکی بۆ دروست دەکرێت ، هەر کەس رەوشتی بەرز و ئاکاری جوان بێ لە بەشی سەرەوەی بە هەشتدا خانوویەکی بۆ دروست دەکرێت ..؟!

---

[٣٣]-سنن ابو داود برقم (٤٧٩٨).
[٣٤]-سنن ابو داود برقم (٤٧٩٩).
[٣٥]-سنن الترمذي برقم (١٩٩٣).



۳-ڕاستگۆیی دلنیایی و ئاسوودەیی دەروون دەهێنێتەدێ :

بەڵێ ڕێبازی قورئانی پیرۆز کە پێگەو مەنزیلەت و ڕەوشت بەرزی ئاکاری جوانی مرۆڤ کە ڕاستگۆییە پێگەو فەزیلێکی زۆری بۆ داناوە ، هەروەها ئەم ڕەوشت ئاکارە جوانە لە رووحی گۆمەلگایی ئیسلامی جێگیر کردووە ، وە فەزلێکی تایبەتی بۆ داناوە کە ئایینی ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات ، ئەویش ڕاستگۆییە ،هەلبەتە ڕاستگۆیی دەگوازرێتەوە بۆ ئاستی بەرز ، وە لە پلە بەرزو بەهاکانی جیهاندایە ، ئەویش پێگەو مەنزیلە پلەی ڕاستگۆییە ، چونکە ئارامی ئاسوودەیی دلنیابوون دروست دەکات ، هەروەها نەفسی مرۆڤەکان ئاسوودە و مرتاح دەکات ، ئەو ئاسوودەیە لە نێوان ڕاستگۆیان دا پەرە دەسێنی ڕاستی و دروستی لە نێوانیاندا ، هەموو کەسێك لە ڕاستی دا نەفسی ئارام دەبێتەوە ، وە دلنیایی و متمانەی بە دەوربەرەکەی خۆی دەبێت ئاسوودە دەبێت ، بێ گومان بەرهەمی ڕاستگۆیی یەکجار زۆرە لە ژیانی دونیادا هەر گیز هەژمار ناکرێت...

لە (حسن کوری علی کوری ابو تالیب ) – خوا لێیان ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە دەی فەرموو: ((دَعْ ما يَريبُك إلى ما لا يَريبُك، فإنَّ الصدقَ طمأنينةٌ وإنَّ الكذبَ رِيبةٌ. وفي الحديث قصةٌ )). [٣٦] واتە: واز لە وە بهێنە کە دەتخاتە گومانەوە ، بۆ شتێك کە ناتخاتە گومانەوە ، چونکە بێ گومان ڕاستگۆیی دلنیاییە ، درۆ و دەلە سەش ڕارایی و دوو دلییە ..؟!

لە (عبدالله کوری عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أربعٌ إذا كُنَّ فيك فلا عليك ما فاتك مِنَ الدُّنيا : حِفْظُ أمانةٍ وصِدْقُ حديثٍ وحُسنُ خَليقةٍ وعِفَّةُ طُعْمةٍ )) . [٣٧] واتە: ئەگەر مرۆڤ چوار شتی هەیە ، پێویست ناکات خەمی ئەوەت هەبێت لەم دونیایەدا لە دەستت داوە : پاراستنی ئەمانەتێك لە مال و بەر پرسیاریەتیك ، وە ڕاستگۆیی لە گێرانەوەی هەواڵێك بەڕاست و دروستی ، وە ڕەوشت بەرزی یان خۆرەوشت و ئاکاری جوان ، وازهێنانی لە جێژ حەرام ، پابەند بوون بە جێژی حەلال لە خواردن و خواردنەوە جل و بەرگ و مال و خانوودا ..؟!

---

[٣٦]-سنن الترمذي برقم (٢٥١٨).
[٣٧]-ابن عدي ، (الكامل في الضعفاء ) (٢٥٦/١)، و ابن عساكر في (التاريخ دمشق ) (١٠٤/٧٢).

٤-ڕاستگۆیی ڕزگار بوونە لە هەموو ناخۆشیەکانی دونیادا :

بەڵێ ڕاستگۆیی بریتیەلە : نیەت پاکی لە گوفتارو کردار دا ، کارو کردەوەکەش چاك دەکات ، هەر بۆیە کارو کردەوەی چاکە بەرهەمی یەکجار زۆری هەیە لە ژیانی دونیادا ، وە خاوەنەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی گەورەی دەست دەکەوێت ، وە یەکێك لەو ئامۆژگاریە باشانەی کە لەو ڕووداوەی کە لەنێوان سێ کەسە کە ڕوویدا لە ناو ئەشکەوتێکدا دەرگا کەیان لێ داخرا ، لە نێوان خۆیاندا بە یەکتریان ووت : بە خوا ئەی خەلکینە تەنها بەس ڕاستگۆیی ڕزگارمان دەکات ، ئینجا ووتیان : با هەر پیاوێك لە ئێوە دوعا بکات بۆ ئەوەی کە دەزانێت ڕاستە ، یەکێکیان پاکیەتی خۆی بسلمێنی ، وە ئەوەی تریان بە ئەمانەت دەست پاکی ، وە ئەوی تریشیان بە چاکە کردن لەگەل دایك و باوکی دا ، پاشان (خوای گەورە ) ڕزگاری کردن ..؟! بەلێ ئەم سێ پیاوە لە ناخۆشترین کات و هەلومەرجدا دەرگایی ئەشکەوتیان لە سەر داخرا ، وە پارانەوە دوعایان کرد لە (خوای گەورە ) هەر یە کەیان بە ڕاستگۆ ترین کارو کردەوە چاکەکانیان ، وە دلسۆزی خۆیان دەربر بۆ پەروەردگاری خۆیان لە کارو کردەوەکانیان کە پێشتر ئەنجامیاندا بووە ، ئەو ڕاستگۆیی و دلسۆزیە کە لە کارەکانیان هەیان بوو ، ئەمە بووە هۆی ڕزگار بوونیان لە ئەشکەوتەدا ..؟!

هەروەها ڕزگار بوونی (دایکە عائیشە) – خوا لێ ڕازی بێت – لە ڕووداوی ئەفك ، کە دوو ڕووەکان بووختانیان پێدا کرد ، بەلام ڕاستگۆیی بێ تاوانی (دایکە عائشە ) ڕزگاری کرد لە بووختانە..؟!

لە (عائشە ام المومنین ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی: (( ... أَمَّا بَعْدُ يا عَائِشَةُ، فإنَّه قدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فإنْ كُنْتِ بَرِيئَةً، فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وإنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إلَيْهِ ... )).[٣٨] واتە: ئەی (عائشە ) لە بارەی تۆ ئەوە و ئەمەم پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ پاکیت ، ئەوا (خوای گەورە ) پاکیەتیت دەردەخات ، خۆ ئەگەر لە گوناهێك نزیکیت ئەوا داوایی لێخۆش بوون لە (خوای گەورە) بکە تەوبە بکە ..؟!

تێبینی : ئەم فەرموودەیە زۆر درێژە ، لە بەر درێژی باسەکە بە کوورتی باسی فەرموودەکەمان کردووە کە فەرموودەی (حادثة الإفك ) یان ڕوودانی بووخانە کە ..؟!

---

[٣٨]- صحيح مسلم برقم (٢٧٧٠).

بەڵێ پاشان (خوای گەورە ) بێ تاوانی و بەرائەتی (دایکە عائشە)ی– خوا لێ رازی بێت – سەلماند لە حەوت ئاسمانەوە وەحی دابەزیە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە بێ تاوانی ئەم ئافرەتەی دوو پات کردەوە کە برائەتی و پاکیزەیی دەسەلمێنی ، هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ [النُّور : ١١] واتە :{ڕووداوی بوهتان کردن بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداران (حادثة الإفك)} [ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ ] ئەو کەسانەی کە ڕووداوی ئیفك و بوهتان هەڵبەستنیان بۆ (عائیشە)ی دایکی باوەڕداران هەڵبەست، کە لە (بوخاری و موسلیم و سونەنەکان)دا هاتووە کە ئەم دە ئایەتە لەسەر پاکێتی (عائیشە) دابەزی، دوای ئەوەی لە یەکێك لە غەزاکاندا دوا کەوت وە (صەفوانی کوڕی موعە¬طەل)یش دواکەوت پاشان (صەفوان) (عائیشە)ی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کە مونافیقان بینیان هەردووکیان بەیەکەوە دواکەوتوونە بوهتانیان بۆ (عائیشە) کردو وتیان: لەگەڵ (صەفوان)دا زینای کردووە، جا ئەو کەسانەی کە ئەو بوهتانەیان کردو ئەو درۆیەیان هەڵبەست [ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ] کۆمەڵێك بوون لە ئێوە کە (حەسانی کوڕی ثابت و میسطە¬حی کوڕی ئوثاثەو حەمنەی کچی جەحش) بوون و لەمانەوە بیسترا [ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ ] وا مەزانن کە ئەمە شەڕو خراپە بێت بۆ ئێوە بەڵکو بەهۆیەوە ئەجرو پاداشتی زۆر وەرئەگرن [ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ] بەڵکو ئەمە خێرو چاکەیە بۆ ئێوەو بەخێر بەسەرتاندا ئەشکێتەوەو پلەتان بەرز دەبێتەوەو خوای گەورە گرنگی و بایەخی بە (عائیشە) داو لەسەری هاتە وەڵام و بەرگری لێکردو پاکێتی دەرخست و ئایەتی لەسەر ناردە خوارەوە [ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ] وە هەر یەکێك لەوانەی کە ئەو قسەیەی کردووە بەشی خۆی تاوان هەڵئەگرێ [ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ ] بەڵام ئەو کەسەیشی کە سەرەتا بە ئیشەکە هەڵساوەو سەرپەرشتی کرد کە (عبداللە¬ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)ی سەرۆکی مونافیقان بوو [ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] ئەمە سزایەکی یەکجار گەورەی هەیە لای خوای گەورە، وە سیانەکەی تریش کە لێیان بیسترا پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - یەکی هەشتا جەڵدەی لێ دان..؟!

هەروەها یەکێکی تریش لە چیرۆکە قورئانیە کان ئەویش چیرۆکی (ابراهیم) – علیه السلام – کە لە خەوندا راستگۆ بوو ، ، بەڵێ (ابراهیم) لە خەوبینی یەکەی زۆر بە راستگۆیانەو دلسۆزانەوە دەست بەجێ ئامادەکاری دەکات بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکەی (خوای گەورە) ، بۆ سەر برینی (اسماعیل)ی کوری ئینجا پێ دەلێت : پەروەردگارم فەرمانی پێ کردووم بە سەر برینی تۆ ، ئەویش فەرمانی باوکی ناشکێنی و راست و دروست و دلسۆزانەوە ئامادە دەبێت بۆ جێ بەجێ کردنی داوەکەی باوکی ، بەلام (خوای گەورە) لە بەر دلسۆزی راستگۆیانەی ئەم دووانە ، لە فەرمانە رزگاریان دەکات کە بەرانێکی بۆ رەوانەدەکات لە جیاتی کورەکەی سەر ببرێ ، ئەمەش بەرهەمی راستگۆیی لە ژیانی دونیادا ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ۝١٠٤ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٠٥ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ۝١٠٦ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ۝١٠٧ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ۝١٠٨ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ۝١٠٩ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١١٠﴾ [الصَّافَّات : ١٠٤ – ١١٠] واتە : [وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: بانگمان کرد ئەی ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - ..؟! [ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ] بەڕاستی تۆ خەوەکەت جێبەجێ کردو ڕاستگۆ بوویت و خەوەکەت بەڕاست دانا [ إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ] ئێمە بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوەو ئەوەی گوێڕایەڵیمان بکات ناخۆشی و تەنگانەی لەسەر لادەبەین و دەروی خێری لێدەکەینەوە..؟! [ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ] ئەمە بەڕاستی تاقیکردنەوەیەکی زۆر ئاشکرا بوو بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل (عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، وە لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتن و ناجیح بوون..؟! {خوای گەورە لە جیاتی ئیسماعیل - صلى الله عليه وسلم - بەرانێك دەنێرێت} [ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ] وە خوای گەورە لە جیاتی ئیسماعیل - صلى الله عليه وسلم - بەرانێکی شاخداری لە بەهەشتەوە بۆ ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - نارد تا لە جیاتی ئیسماعیلی کوڕی - صلى الله عليه وسلم - سەری ببڕێت، (لەم کاتەوە قوربانی کردن تەشریع بووەو عیبادەتێکی گەورەیەو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - هەموو ساڵێك دوو بەرانی شاخداری ڕەش و سپی کردووە بە قوربانی و پێویستە ئەوەی توانای هەبێت قوربانی بکات)..؟! [ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ] وە ڕێزو مەدح و سەناو ستایشیمان لەناو ئوممەتەکانی دواتردا بەجێهێشت کە مەدحی بکەن..؟! [ سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ] سڵاو لە ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - بێت..؟! [ كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ] ئێمە بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە..؟!

بەڵێ ڕاستگۆیی لە مامەڵەکردن ، یان کرین فرۆشتندا ، ئەگەر لە هەر کرین فرۆشتن مامەڵەکردنێکدا ، ئەوا رستگۆ بێن ،ئەو کرین فرۆشتەو مامەڵەکردنە برکەت نیعمەت خێری دەداتەو ، بۆ هەر کەسێك کە ئەنجامی دەدات ، بێ گومان یەکێك لە سوودەکانی ڕاستگۆی لە مامەڵەو کرین فرشتن ئەوەیە نیعمەتێك لە رزق رۆزی و بژێوی ژیانی ڕۆژانەی خەلك ، هەروەها هۆکارێکە بۆ گەشەو دولەمەند بوون رزق رۆزی زۆر ، چونکە رزق و رۆزی تەنها بە ڕاستگۆی حەلالە پاك وبێگەردە ، ئەوەی تریان هەر هەمووی حەرام پووچەل و پاتلە ، ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خو ﷺ ..؟!

لە (حکیم بن حزام ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((البَيّعانِ بالخيارِ ما لم يَتفرَّقَا، فإنْ صدَقَا وبَيَّنَا، بورِكَ لهما في بَيعِهما، وإنْ كذَبَا وكتَمَا مُحِق بَرَكةُ بَيعِهما )) .[٣٩] واتە: کریارو فرۆشیار هەر یەکێکیان بۆ خۆیان سەر پشکن لە کرین و فرۆشتنەکەیان ، یان لە سەوداو مامەلەکەیاندا هەتا لێك جیادبنەوە ، جا ئەگەر ڕاستگۆ بوون و شتەکانیان بە جوانی خستەروو ئەو خێرو بەرەکەت دەکەوێتە سەوداو مامەلەکەیانەوە، ئەگەر درۆشیان کردو ڕاستیەکەیان شاردەوە ئەوە خێرو بەرەکەت لە سەوداو مامەلە کەیاندا نامێنێت ..؟!

[٣٩]-سنن الترمذي برقم (١٢٤٦) ، البخاري برقم (٢١١٠)، مسلم برقم (١٥٣٢)، النسائي برقم (٤٤٦٩).

دووەم: کاریگەر و بەرهەمی راستگۆیی لە رۆژی دوایی :

١-بەدەست هێنانی پلەی راستگۆیی دوایی پلەی پێغەمبەران دێت :

(خوای گەورە) دەفەرمووێ: قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە: [ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ] پیاوێك لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - کە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فلانە کەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - شتێکە بیرم لێ کردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەکەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگەین، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات- صلى الله عليه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان [ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا ] کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی و هاوەڵێتیان بکات..؟!

٢-ڕاستگۆیی خاوەنکەی ڕزگار دەکات لە نەهامەتیەکانی ڕۆژی دوایی :

بەڵێ (خوای گەورە ) پێمان رادەگەیەنێ کە هیچ شتێك سوودی بۆ بەندە نابێت و ڕزگاری ناکات لە سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی دا ، هەروەها تەنانەت ماڵ و سامان منداڵ و سوودی بۆ نابێت ، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بەدڵێکی تەندروست ساغەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای (خوای گەورە) دڵی تەندروست ساغیش ئەوەیە کە ڕاستگۆی ئەخلاص و دڵسۆزی تەواوی هەبێت لە پێناوی خوا ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە: [ قَالَ اللَّهُ هَذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ] خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانەی کە لە دونیادا ڕاستگۆبوونە ئێستا ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ ئەگەیەنێ، (ابن عباس) ئەفەرمێت: ڕۆژێکە یەکخواپەرستی سود بە یەکخواپەرستان دەگەیەنێت [ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ] ئەوە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە ئەیانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات و جۆگەلە ئاو بەژێر خانو دارەکاندا تێ ئەپەڕێ [ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ] بەهەمیشە یی و بەنەمری تیایدا ئەمێننەوە [ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ] خوای گەورە لێیان ڕازیە بەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیا کردوویانە [ وَرَضُوا عَنْهُ ] ئەوانیش بەو بەش و پاداشتەی کە خوای گەورە ئەیانداتێ پێی ڕازین کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتووە [ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ] ئا ئەمە بردنەوەی هەر گەورەیە کە مرۆڤ بچێتە بەهەشتەوە..؟!

٣-ڕاستگۆی دەچێتە پێگەو مەنزیلە و پلەی شەهیدان و چاکە کاران :

بەڵێ پێگەو پلەی ڕاستگۆیی زۆر گەورەیە ، ئەگەر بەندە ڕاستگۆ بێت لە ژیانی دونیادا ئەوا مەنزیلە و پلەی لە جێگای شەهیدان و چاکە کارانە ، بێ گومان ئەم پێگەو پلەو مەنزیلەیەش لە دوای پێغەمبەرانەوە – علیهم السلام – دەبێت ، کە پلەی شهیدان و چاکەکاران ئارام گران پێغەمبەرانە ، هەلبەت ئەو پلەیەش کە مەنزیلەی یان پێگەی ڕاستگۆیی یە لەگەل ئەمانەیە ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە: [ قَالَ اللَّهُ هَذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ] خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانەی کە لە دونیادا ڕاستگۆبوونە ئێستا ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ ئەگەیەنێ، (ابن عباس) ئەفەرمێت: ڕۆژێکە یەکخواپەرستی سود بە یەکخواپەرستان دەگەیەنێت [ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ] ئەوە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە ئەیانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات و جۆگەلە ئاو بەژێر خانو دارەکاندا تێ ئەپەڕێ [ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ] بەهەمیشە یی و بەنەمری تیایدا ئەمێننەوە [ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ ] خوای گەورە لێیان ڕازیە بەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیا کردوویانە [ وَرَضُوا عَنْهُ ] ئەوانیش بەو بەش و پاداشتەی کە خوای گەورە ئەیانداتێ پێی ڕازین کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتووە [ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ] ئا ئەمە بردنەوەی هەر گەورەیە کە مرۆڤ بچێتە بەهەشتەوە..؟!

لە( سهل بن حنيف ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((مَن سَأَلَ اللَّهَ الشَّهادَةَ بصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنازِلَ الشُّهَداءِ، وإنْ ماتَ علَى فِراشِهِ. ولَمْ يَذْكُرْ أبو الطَّاهِرِ فى حَديثِهِ: بصِدْقٍ )). [٤٠] واتە: هەر کەس بەڕاستی داوای شەهیدبوون لە (خوای گەورە) بکات ، ئەوا (خوای گەورە) دەگەیەنێتە پلەی شەهیدان با لە سەر جێگەی خۆشی بمرێت..؟!

[٤٠]-صحيح مسلم برقم (١٩٠٩).

٤-ڕاستگۆیی خاوەنەکەی دەباتە نێو بەهەشتەوە :

لە گەورە ترین بەرهەمەکانی ڕاستگۆیی ئەوەیە کە هیدایەت و ڕێنمووی دەدرێت بۆ ڕێگای چاکەکاری ، ئەم ڕێگایەش بێ گومان ڕێگای چوونە بەهەشتە ، هەر وەك ئەم فەرموودەیی لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – پێشدا باسمان کرد ..؟!

عن (عبدالله بن مسعود ) –رضي الله عنه – عن النبي ﷺ قال : (( إن الصدق يهدي إلى البر ، وإن البر يهدي إلى الجنة ، وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقا ، وغن الكذب يهدي إلى الفجور ، وإن الفجور يهدي إلى النار ، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا ) .[٤١]

واتە: لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( پێویست لە سەرتان ڕاستگۆ بن بە ڕاستی  ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنمویی دەکات بۆ چاکە ، چاکەش ڕێنمویی دەکات بۆ بەهەشت ، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەکات و بەدوایی ڕاستیدا گەرێت ، تا لای خوا بە ڕاستگۆ تۆمار دەکرێ ، خۆتان بپارێزن لە درۆ ، بەڕاستی  دۆر مرۆڤ بەرەوە کاری خراپ دەبات ، کاری خراپیش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بە دوایی درۆدا دەروات لای خوا بە درۆزن لە قەلەم دەدرێت ..؟!)

لە (عبادة بن صامت ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
((اضمَنوا لي سِتًّا من أنفسِكم أضمنُ لكم الجنَّةَ اصدُقوا إذا حدَّثتُم وأوفوا إذا وعدتم وأدُّوا إذا ائتُمِنتم واحفظوا فُروجَكم وغُضُّوا أبصارَكم وكُفُّوا أيديَكم )) .[٤٢] واتە : شەش کردوە گرینتی یان زمان بکەن لە نەفسی خۆتان ، ئەوا منیش گرنتی یان زمانی بەهەشتان دەدەمێ ، ئەمانەن : ڕاستگۆیی لە قسە کردن ، وفاداری یان بەرانبەر بە بەلێن و وعد ، ئەمانەت پارێزی ، پارێزگاری لە داوێن ، پارێزگاری لە چاوتان بکەن دایبخەن لە حەرام کراوەکان ، دەست پاك بن پارێزگاری لە دەستەکان بکەن ..؟!

---

[٤١]-صحيح البخاري برقم (٦٠٩٤) ، مسلم برقم (٢٦٠٧).
[٤٢]- الترغيب والترهيب (المنذري ) (٤/٥٠)، ابن ابي الدنيا (مكارم الاخلاق ) (١١٦)، ابن حبان (٢٧١).

## سوودەکانی راستگۆیی لە مەبەست مەرامدا

بەڵێ یەکەمین راستگۆیی لە مەبەست مەرامە ، بەم جۆرەیە هەرچی کەمو کوری هەیە راستگۆیی کۆتایی پێ دەهێنێت ، وە هەرچی لە دەست چووە بەدەستی دەهێنیەوە ، وە هەرچی ویران و دارماوە ئاوەدانی دەکەیتەوە ، وە نیشانەی راستگۆیی ئەو راستیەی که وەلامی بانگکەرێك نەداتەوە بانگ بۆ شکاندنی پەیمان دەکات ، هەروەها دان بە خۆدا نەگرێت لە هاوەلی کردنی دژی ئەو راستگۆیە ، لەهیچ بارێکدا لە سووربوون ولێبران ساردنەبێتەوە و دانەنیشێت ..؟!

بێ گومان ئەوەش : بریتیە لە کمالی سووربوون ولێبران ، و هێزی ویست بەوەی لە دلدا بانگەرێکی راستگۆ بۆ گرتنەبەری رێگەی رەوشت یان ئەخلاق و سلوکی هەبێت ، وە مەرامێکی یان مەیلێکی زۆر سەر هەلبدات تا پەنهان و نهێنی یان سری مرۆڤ ژێر دەستە بکات بۆ ئاراستە وەرگرتنی دروست ، ئەوا داوایەکە ریا بازی و ساردبوونەوەی تێکەل نابێت پێی ، وە لەهیچ بارێکدا دابەشبوون رووی تێناکات ، چونکە رۆیشتنە ناو سەفەر بەرەو (خوای گەورە ) و ئامادەباشی بۆ چاو پێکەوتن بۆ (خودای پەروەردگار ) تەنها ئەم جۆرە لە راستگۆیی دەبێت ..؟!

بەلێ ئەم راستگۆییە هەلگری هەموو هۆیەکی گەیشتنە بە لقای (خوای گەورە ) وە لادەری هەر هۆیە لە هۆیەکان وەك ناراستی یان درۆ کردن ، ئەوا بێ گومان لە (خوای گەورە ) دا دووری دەخاتەوە ، ئەم راستگۆییە ویست مەرام ، هەلبەتە هیچ هەلێك لە دەست نادات و ئەو هەلانەش لە دەست چوون بە پێی توانا بەدەستی دەهێنێتەوە ، بۆیە ئەو کەسەی کە راستگۆیە هیچ شتێك لە دەست نادات بەلکو هەر بەراستگۆیی بەدەستی دەهێنێتەوە ئەوەی کە زیانی لێکەوتووە لە دونیادا ، بێ گومان ئەوەی کە تەماع و شەهوەت و بێ ئاگای لە گوناهو تاوان لە دلدا وێرانیان کردووە بە راستگۆیی ویست و مەرام چاکی دەکاتەوە ، ئەوەی کە دەست بەتالی و بێکاری وێران و چۆلی کردووە ئاوەدانی دەکاتەوە و بەدەستی دەهێنێتەوە ، ئەوەی کە حەزەکانی دل دەروون خامۆشی کردووە رووناکی لە نێو دلی نەماوە راستگۆی ویست مەرام دادەگیرسێنێتەوە ، ئەوەی کە لە رابردوودا کەمتەرخەمی لێ کردووە تێکو پێکی داوە رێکی دەخاتەوە ...

بەڵێ ڕاستگۆیی لە ویست مەرامدا ئەوەی کە لە ڕابردوودا فێڵبازان دزەکان درۆزنەکان و بوختان چییەکان تالاچییەکان ئەوانەی کە شتیان لێ زەوت کردووە ، وەریان دەگرێتەوە ، هەر وەها ئەوەی کە زولم ستەمیان لێ کردووە لە ڕاستگۆی ویست مەرامدا بێ گومان لێ یان دەسێنێتەوە ، بۆ نموونە ئەو زەویە بوورە وشکە کە لێیان دزیەوە بەفێڵ ئەوا وەری دەگرێتەوە دەکێڵێت و سەوزی دەکاتەوە ، ڕاستگۆیی مەبەست یان ویست مەرام خۆی خالی دەکاتەوە لە ڕەشبینی و بێ هیوایی و بێهودەی ژیان ، وە یان دەستەوئەژنۆبوون کە هەر هەمووی کە دڵ یان پر کردووە خالی دەکاتەوە ، ئەو کارو کردەوە گوفتارانەی کە ناپەسندو ناپووت تێکدەرن کە مرۆڤ بەرەو تیاچوون و پەککەوتن و ئیفلیس دەبەن ، چاك دەکاتەوە ، بەڵێ ڕاستگۆی ویست مەرام ئەو پیسی لیتە کە بە تێپەر بوونی کات لە ناو دلی دا کۆی کردۆتەوە خاوێن دەبێتەوە ، بۆیە کاتێك سەرنجی ئەو دلە پیس ژەنگاویەی دەکات و خەم و پەژارە دایی دەگرێت ، ئەو بێ گومان تەنها بە ئاوی ساردی کانیاوی ڕاساگۆیی ویست مەرام خاوێن دەبێتەوە ، چونکە بەر لەوەی دۆزەخ بە ئاگرەکەی خاوێنی بکاتەوە ئەوا بەڕاستگۆی ویست مەرام پاك دەبێتەو ، چونکە بێ گومان دلێکی پیسی پر لە حەز شەهوات ئارەزوو بازی و دوو ڕوویی درۆکردن ، هەر گیز ناتوانێت ئاشت بێتەوە لەگەل (خوای گەورە ) تەنها بە ڕاسگۆیی ویست مەرام نەبێت ئەویش ئەو پەری ڕاستگۆیی و ئەخلاص و دلسۆزیە لە گەل (خوای گەورە ) دا ، بەلێ هەر دەبێت ئەم دلە پاك بێتەوە لە هەموو ڕەش پیسی یەکدا ، هەر بۆیە مرۆڤی ژیرو هۆشیار ئاسانترین پاکەرەوە هەلدەبژێرێت کە پاك بوونەوەیە لە ژیانی دونیادا بەر لە گەیشتن بە ڕۆژی قیامەت یان ڕۆژی دوایی ، کۆمەك ویارمەتی هەر لە (خوای گەورە ) دەکات ، ڕاستگۆییە هەر لە پێناوی (خوای گەورە ) دا ، ئەخلاص دلسۆزی نیاز پاکە هەر لە پێناوی (خوای گەورە) دا ، کار کردەوەی چاکە دەکات هەر بۆ (خوای گەورە) یە ، هەر گیز مرۆڤی زیرەك و هۆشیارو ژیر ، بۆ خاتی فلام فیسکە یان ئەو کەس و ئەو بەپرس و ئەو خزم و ئەمان کارێك ناکات ، بەلکو ئەوی دەکات ئەوەیە تاچەند (خوای گەورە ) ڕەزامەندە لە سەر کارو کردەوەکانی ، ئەگەر فەرمانی (خوای گەورە )ی لەسەر بێت ئەنجامی دەدات ، ئەگەر هەر کارێك (خوای گەورە ) قەدەغەی کردووە ، ئەوا خۆی لێ بەدوور دەگرێت و ئەنجامی نادات، هەر بۆیە ڕاستگۆیی لە ویست مەرام دا ئەوەیە کەباسمان کرد چەند سوودی بۆ خاوەنەکەی هەیە ئەگەر لە پێناوی (خوای گەورە ) بێت بەتەنها ، ئینجا (خوای گەورە ) پشت پەنات دەبێت..؟!

